تەرکیز
مەشقەکانی خوێندنەوە
فێرکارییەکانی عەقڵ
سروشەکانی فێرکاری
توانای مێشك
نەخشەی عەقڵ

پڕفرۆشترین کتێبی (تۆنی بوزان) کەملیۆنان نوسخەی لێ فرۆشراوە

# مێشکت بەکاربهێنە

## (دە) ڕێگا بۆ بەهێزکردنی توانا عەقڵی و هزرییەکانمان





تۆنی بوزان

مێشکی تۆ لەوە باشترە کە بیری لێ دەکەیتەوە

وەرگێڕانی: هاوار کریم

 ktebi_pdf  




| 232 | 19k | 7 |
| --- | --- | --- |
| posts | followers | following |

Message  

**پەڕەی فەرمی 📚 کتێبی PDF 📚**

Public Figure

لێرە
باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان
بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

👻Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان

SEE TRANSLATION

drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu3...

Hawraman, Slemani, As Sulaymaniyah, Iraq

Followed by cinema_arts_, 3ishwa, jihani_zanyari + 12 more




💎 گەنجینە 💎




🌷 گوڵدان 🌷




snapchat

Directions

# مێشکت بەکاربهێنە

(دە) ڕێگا بۆ بەهێزکردنی توانا عەقڵی و هزرییەکانمان

تۆنی بوزان
وەرگێڕانی: هاوار کریم

چاپی یەکەم
٢٠١٨

# پێڕست

# پێشەکی

هامیلت: مرۆڤ چییە؟ ئەگەر ئیشی سەرەکی مرۆڤ خواردن و خواردنەوە بێت؟ جگە لە ئاژەڵێک زیاتر هیچی تر نییە. بەدڵنیاییەوە ئەوەی کە ئێمەی بەم شێوە باڵایە خەڵقکردووە ئەگەر سەرنجی ڕابردوو و ئایندە بدەن هێز و توانایەکی لەبنەهاتووی پێداوین بۆئەوەی ڕێگریبکەین لە بۆگەنی و بێدەسەڵاتیمان، هۆکارەی بێئاگایی ئاژەڵی بێت یان دڕدۆنگی نا مەردانە.

(هامیلت، شازادەی دانیماری، نمایشی چوارەم)

ئەم کتێبە نوسراوە بۆ ئەوەی لە ئەنجامی ئەو کارەدا یارمەتیدەرتان بێت کە شکسپیر گووتی دەبێت ئەنجامیبدەن و ئەویش بەکارهێنان و سوودوەرگرتنە لە هێز و توانای عەڵ و هزر! کاتێک کە تەواوی کتێبەکە دەخوێننەوە تێدەگەن کە زانیارییەکی زۆرتان لەسەر چۆنێتی کارکردنی مێشک دەستدەکەوێت و ئەوکات دەزانن کە چۆن بە باشترین شێوە بەهرە لە توانا عەقڵییەکانتان وەربگرن، توانای ئەوەتان دەبێت خێراتر و بەکاریگەرتر بخوێننەوە

و وێنەیەکی عەقڵی باشتر بکێشن، ئاسانتر بەسەر گرفتەکانتاندا زاڵبن، توانای یادگە و حافیزەتان فراوانتر و گەورەتر بکەنەوە.
ئەم پێشەکییە سەرەداوێکی گشتییە سەبارەت بە ناوەڕۆکی کتێبەکە و ڕێگا و شێوازێک بۆ تێگەیشتنی باشتری کتێبەکە تەرخانکراوە.

## بەشەکانی کتێبەکە

هەر بەشێک پەیوەندیی بە لایەنێکی جیاوازی مێشکی ئێوەوە هەیە. لە سەرەتای کتێبەکەدا نوێترین زانیاری سەبارەت بە مێشک دەخاتەڕوو، دواتر بەشێوەیەک سوود لەم زانیارییانە وەردەگرێت، بۆئەوەی ڕوئیا و دونیابینی و دیدگاتان بەباشترین شێوە سوودی لێببینێت.
لە بەشی پێنجەمدا ئەوە ڕووندەکاتەوە کە چۆن دەتوانن هێزی یادگە لە کاتی فێربوون و تەنانەت دوای ئەویش گەشە پێبدەن، لەگەڵ ئەوەشدا سیستەمێکی تایبەت بۆ پاراستنی تەواوی لیستەکان خراوەتەڕوو.
بەشەکانی ناوەند شرۆڤە و شیکردنەوە بۆ وێنە عەقڵی و هزرییەکانی دەرونتان دەکات، زانیاریی چۆنێتی کارکردنی بیری ئێوە، بەشێوەیەکی وا سوودی لێدەبینێت کە بتوانن زمان، وشەکان، شیکردنە و وێنە عەقڵییەکان بۆ جێگیرکردن و ڕێکخستن، یادهێنانەوە، بیرکردنەوەی داهێنەرانە و چارەسەر و زاڵبوون بەسەر گرفتەکاندا بەکاریبهێنن.
بەشی نۆهەم پەیوەندیی بە تەکنیکی خوێندنەوەی ڕێکخستنی وێنەی عەقڵی نوێیە کە ئەو توانایەتان پێدەدات لە هەموو زەمینە

زانستییەکاندا لە ئینگلیزییەوە بگرە تا بیرکاری، فەلسەفە و کۆمەڵناسی، زمانەکانی تر خوێندنەوەتان هەبێت.

بەشی کۆتایی کورتەی ئەو قەڵەمبازە گەورانەیە کە لە سی ساڵی کۆتاییدا بەخۆیەوە بینیویەتی و دۆزینەوەی تازە سەبارەت بە بەرزبوونەوەی تەمەنی عەقڵی دەخاتەڕوو و دەبێتەهۆی ئەوەی لایەنگەلێکی نوێ لە ئاییندەدا بۆ خوێندنەوە بەدەستبهێنن.

## هەوڵی ئێوە

ئەگەر دەتانەوێت سوودێکی کاریگەرتر لەو یاسا و زانیارییانە وەرگرن کە خراونەتەڕوو، پێویستە هەوڵبدەن و ڕاهێنانی لەسەر بکەن! لە بەشە جیاوازەکانی کتێبەکەدا هەندێک ڕاهێنان و پێشنیار بۆ چالاکبوونی زیاتر خراونەتەڕوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بەرنامەی ڕاهێنان و خوێندنەوە بۆ خۆتان ڕێکبخەن و پلانی بۆ دابنێن و ئیتر لەسەر ئەو بەرنامە و پلانە بڕۆن بەڕێوە.

## یاداشت و داواکارییە تایبەتییەکان

لە کۆتایی هەر بەشێکدا لاپەڕەیەک سەبارەت بە یاداشت و داواکارییە تایبەت و کەسییەکان هەیە، ئەم لاپەڕەیە بۆ نوسینی ئەو بابەتانەن کە ڕەنگە بتانەوێت لە کاتی خوێندنەوەی کتێبەکەدا یاداشتی بکەن و بینوسن، یان کاتێک زانیاریی و داواکاریی زیاتر وەردەگرن لە کاتی خوێندنەوەی کتێبەکەدا، دەتوانن سوودی لێببینن.

## ئێوە و خۆتان

ئامانجی سەرەکی لە نوسینی ئەم کتێبەدا، یارمەتیدانی ئێوە بۆ بەروپێشچوون تا لە ڕێگەی گەشەکردنی ئاگایی و هۆشیارییتانەوە بتوانن شێوازی بیرکردنەوەتان فراوانبکەنەوە.

ئەوانەی کە سوود زانیارییەکانی ئەم کتێبە دەبینن، ئاستی فێربوونێکی جیاوازتریان هەیە و بەخێراییەک بەرەو پێشەوە دەچن کە زیاتر شایستەی خۆیانە، کەواتە خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەیە هەمیشە ئەندازەی پێشکەوتنەکانتنان بە بەراورد بە ڕۆژانی پێشووتری خۆتان بگرن و سەرنجبدەن.

## بۆ پێشەوە

ئەگەرچی زیاتر زانیارییەکانی نێو ئەم کتێبە تایبەتە بە خوێندنەوە و یاداشتکردن و لێکۆڵینەوە، بەڵام کاریگەریی زۆر لەوە زیاتری هەیە. کاتێک بە تەواوەتی هەموو کتێبەکە دەخوێننەوە، دووبارە لاپەڕەکان هەڵدەنەوە بۆئەوەی بزانن لە چی بوارێکی ژیانتاندا ئەم زانیارییانە دەتوانێت بەشێوەیەکی بەسوودتر یارمەتیتان بدات.

# بەشی یەکەم

## داستانی بەکارهێنانی توانای عەقڵ. ڕوئیایەکی سەرسوڕهێنەر

### چیرۆکی ئیدوارد هیۆس

**دەستپێک**

کتێبی عەقڵی عەقڵ بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٧٤ دا بڵاوکرایەوە. خوێندکارێکی ناوەندی پانزە ساڵان کە بارودۆخێکی خوێندنی باشی نەبوو و لە هیچ وانەیەکدا نمرەیەکی باشی بەدەست نەهێنا لە ساڵی ١٩٨٢ ئاشنای کتێب بوو.

بەهەمان شێوە کە چاوەڕوان دەکرا هەمیشە نمرەکانی C و B دەبوون، ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی ئەوی دڵسارد دەکردەوە چونکە دەیویست لە زانکۆی کامبرج وەربگیرێت ئەو تێگەشت ئەگەر بەمشێوەیە بەردەوام بێت لەسەر خوێندنەکەی هیچ چانسێکی نابێت بۆ زانکۆ دڵخوازەکەی خۆی.

ناوی ئەم خوێندکارە ئیدوارد هیۆس بوو.

دوای ماوەیەک باوکی ئیدوارد کە ناوی جۆرج بوو کتێبی توانای عەقڵی بە ئەو ناساند و زانیاریگەلێکی نوێی لەسەر خود، وێنای عەقڵ، فێربوون و خوێندنەوە خستەبەردەمی، ئیدوارد کە گیانێکی نوێی بەبەردا کرا بوو و ئەنگیزەیەکی زۆری بۆ بەردەوامیدان بە خوێندنەکەی پەیداکرد و گەڕایەوە بۆ خوێندنگا. ئەو بە هەموانی گووت کە دەیەوێت لە هەموو وانەکان نمرەی A (باڵا) بەدەست بهێنێت و بەتەواوەتی دڵنیابێتەوە کە لە زانکۆی کامبرج وەردەگیرێت.

کاردانەوەی مامۆستایەکانی بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر و جیاواز بوو، یەکێک لە مامۆستایەکانی گووتی: ((گاڵتەدەکەیت! ئەوە لەسەرخۆتی! تۆ هیچ چانسێکت نییە، نمرەکانت تەنانەت هەرگیز نزیکی ستانداردەکانی زانکۆی کامبرج نەبوونە.))

دووەمین مامۆستای گووتی: ((وەکو شێتەکان قسە مەکە! ئەگەر نمرەی B بەدەست بهێنیت ڕەنگە هەلی وەرگرتنت هەبێت، بەڵام من دڵنیام نمرەکانی تۆ C دەبن.)) کاتێک کە ئیدوارد لە وەڵامدا گووتی کە نەک تەنها ئومێدەواری ئەوەم کە بتوانم لە ئەزموونی ستانداردی زانکۆ بەشداری بکەم، بەڵکو دەمەوێت فۆڕمی بۆرسی خوێندنیش پڕبکەمەوە، بەڕێوەبەر بەخۆدڵنیاییەوە گووتی: ((نەخێر، بەشداریکردن لە تاقیکردنەوەکان بەهەدەردانی پارە و کاتی خۆتانە، ئێمە وانازانین کە بتوانیت لە تاقیکردنەوەکانت سەرکەوتوو بیت، چونکە تاقیکردنەوەکان زۆر سەختن، تەنانەت زۆرێک لە کاندیدە باشەکانیش نمرەی وەرگرتن وەرناگرن.)) پێداگیری ئیدوارد بوە هۆی ئەوەی خوێندنگاکە مۆڵەتی پێبدات لە تاقیکردنەوە

ئەزمونییەکاندا بەشداری بکات، بەڵام بەمەبەستی هەدەرنەدانی پارەی خوێندنگایەکە ناچاربوو خۆی تێچووی تاقیکردنەوەکە بگرێتەئەستۆ.

سێیەمین مامۆستا گووتی من بۆ دوانزە ساڵ دەبێت ئەو وانەیە دەڵێمەوە و لەو بوارەدا پسپۆڕیی تەواوم هەیە و کاتێک کە دەڵێت هیۆس دەتوانێت نمرەی B یان C بەدەستبهێنێت، زۆر دڵنیایە لە قسەکانی و ئەو دەزانێت چی دەڵێت. مامۆستایەکە ناوی خوێنکارێکی دیکەی هێنا کە زۆر لە ئیدواد باشتر و چالاکتر بوو و گووتی تۆ هەرگیز وەکو ئەو فێرخوازە نابیت، لەو کاتەدا ئیدوارد گووتی: ((من لەگەڵ ئەو بۆچونەت سەبارەت بە بواری خوێندن هاوڕانیم!))

چوارەمین مامۆستا زەردە خەنەیەکی کردوو و گووتی بەدڵنیاییەوە من تواناکانی ئیدوارد دەنرخێنم، ئەو باوەڕی وابوو ئەو ئەگەرە بوونی هەیە کە ئارەزووەکەی ئیدوارد بێتەدی بەڵام چانسی زۆری نییە، باوەڕیی وابوو ئەگەر ئیدوارد زۆر هەوڵبدات دەتوانێت نمرەی B بەدەستبهێنێت، بەڵام ئارەزووی سەرکەوتنی بۆ خواست و گووتی من هەمیشە ئەو کەسانەم خۆشدەوێت کە متمانەیان بەخۆیان هەیە و واخۆیان نیشان دەدەن کە بیرکابەرن.

**((من نمرەی A بەدەست دەهێنم))**

وەڵامی کۆتایی ئیدوارد بۆ هەموو ئەو مامۆستایانەی کە ئامانجەکەیان بەهەند وەرنەگرت، تەنها یەک ڕستە بوو، ئەویش: ((من نمرەی A بەدەست دەهێنم.))

لە سەرەتاوە خوێندنگایەکە نەیدەویست ناوی ئیدوارد بۆ بەشداریکردن لە تاقیکردنەوەکانی کامبریج بنێرێت، بەڵام دوام ماوەیەک ڕازیبوون. بەڕێوەبەری خوێندنگایەکە زانکۆی کامبریجی ئاگادارکردەوە کە سەرۆکایەتی خوێندنگایەکە وانازانن ئەم خوێندکارەیان چانسێکی ئەوتۆی هەبێت بۆ وەرگرتنی لەو زانکۆیە.

قۆناغی دواتر چاوپێکەوتنی بوو لە زانکۆیەکە، ئەندامانی دەستەی زانستی کامربج، بۆچونی خوێندنگایەکەیان خستەڕوو لەبارەی وەرگرتنی لە زانکۆیەکە و ئەوانیش هەمان بۆچونی هاوشێوەیان هەبوو و باوەڕیان وابوو ئەگەری وەرگرتنی ئیدوارد زۆر کەمە، پێداگرییەکانی ئیوداردیان بەرز نرخاند و پێیان گووت لانی کەم پێویستت بە دوو نمرەی B و یەک نمرەی A یە، بەڵام ئەگەر دوو نمرەی A و یەک نمرەی B یان سێ نمرەی A بەدەستبهێنیت، چانسی وەرگرتنت زیاترە دەبێت و ئارەزووی سەرکەوتنیان بۆی خواست.

ئیدوارد هێشتا هەر سەرسەختانە توانا عەقڵییەکانی خستەکار و تاقیکردنەوەی فیزیای بەردەوام پێدا، بە گووتەی خۆی:

کاتی تاقیکردنەوەکان تابێت نزیکتر دەبووەوە، هەموو یاداشتەکانی دوو ساڵی کۆتاییم بە شێوەیەکی ڕێکخراو لە وێنە عەقڵییەکانمدا کورتکردەوە، دواتر هەموو خاڵە بنچینەیەکانم ڕەنگ و دیاریکرد و بۆ هەموو وانەکان وێنەگەلێکی عەقڵی کارامەم درووست کرد و تەنانەت هەندێک کات ئەم وێنانە بەشە سەرەکییەکانی هەر وانەیەکی

له خۆی دەگرت، لەم ڕێگەیەوە دەمتوانی ببینم کە چۆن و بۆچی ڕەگەزە لاوەکییەکان لەگەڵ یەکدیدا پەیوەندییان هەیە و دەگونجێن و لەگەڵ ئەوەشدا دیمەنێکی گشتیی جوان درووست دەکەن، بە سوودوەرگرتن لەم میتۆدە دەمتوانی بەشە گرنگەکان بە خێرای بخوێنمەوە و بابەتەکان زۆر بە دیقەت و وردییەوە بهێنمە یادی خۆم.

یەک هەفتەم تەرخانکرد بۆ چاوپێداخشاندنەوەی ئەم وێنە عەقڵییانە و کاتێک کە کاتی تاقیکردنەوەکان نزیکتر بوونەوە، بەردەوام ئەوانەم دەخوێند. شێوازی ڕاهێنانی وێنەی عەقڵی، لە ڕێگەی سوود وەرگرت لە یادگەوە بوو، لەم ڕێگایەوە دەمزانی چی تێگەیشتن و زانیارییەکم لە بابەتەکە هەیە و ئیتر پێویستی نەدەکرد بگەڕێمەوە سەر کتێب و مەلزەمە و دەفتەرەکان، دواتر ئەم وێنە عەقڵییانەم لەگەڵ وێنە عەقڵییەکانی مامۆستایەکە بەراورد کرد و لێکۆڵینەوەم لەسەر جیاوازییەکانی کرد.

هەروەها دەبوو دڵنیاییم بەخۆم بدایە کە هەموو کتێبە گرنگەکانم خوێندووە، دواتر ئەوانەم کورت کردووەتەوە و باباتەکان زۆر بە وردی و قوڵی فێربووم و وێنەی عەقڵیم لێیان درووستدەکرد بۆئەوەی درک و تێگەیشتن و یادگەم بەهێزبکەم و بیگەینم بە بەرزترین ئاستی خۆی، لەگەڵ ئەوەشدا شێواز و ستایلی ئارتیکڵ و ڕاپۆرتە باشەکانم دیراسە دەکرد و بەهرەم لە وێنە عەقڵییەکانی خۆم وەردەگرت وەکو پرەنسپ و بنەمایەک بۆ ڕاهێنانکردن لەسەر نوسینی ڕاپۆرت و تاقیکردنەوە.

من لەگەڵ خوێندنەکەمدا دەستمکرد بە وەرزشی لەش جوانی ڕۆژی سێ تا چوار کیلۆمەتر ڕاکرن، لە هەفتەیەکدا سێ جار ئەنجامدەدا، هەروەها وەرزشی مەلەکردن، ڕاکشان، هەناسە قوڵکردن، و وەرزش لە وەرزشگا ئەکادیمییەکان، لە ڕووی جەستەییەوە باشتر بوومەوە کە ئەمەش وایکرد تەرکیزم لەسەر خوێندنەکەم زیاتر بێتەوە، ئەو وتە بەناوبانگەی کە دەڵێت: ((بیری تەندرووست بەهۆی جەستەیەکی تەندروستەوە دەبێت.))، بۆیە هەستێکی باشترم سەبارەت بە خۆم و کارەکەم پەیداکرد.

**تاقیکردنەوەکان – نمرەکان**

لە کۆتاییدا ئیدوارد بەشداری تاقیکردنەوەی کرد: جوگرافیا، پرسیاری بۆرسەی خوێندنی جوگرافیا، مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست، بازرگانی، ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی بەمشێوەیەی خوارەوە بوو:

| بابەت | نمرە | پلە |
| --- | --- | --- |
| **جوگرافیا** | A | **خوێندکاری نایاب** |
| **بۆرسی خوێندنی جوگرافیا** | **نمرەی نایاب** | **خوێندکاری نایاب** |
| **مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست** | A | **خوێندکاری نایاب** |
| **بازرگانی** | **نمرەی نایابی A و٢ تابلۆی شانازی** | **خوێندکاری نایاب** |

لە ڕۆژی ئاشکراکردنی ئەنجامی تاقیکردنەوەکان، سەرکەوتنی بەدەستهێنا لە وەرگرتنی لە زانکۆی کامبرج، زانکۆ داواکارییەکەی (مۆڵەتی یەک ساڵ) قبوڵکرد، بۆ ئەوەی کاتێکی باش بۆخۆی فەراهەم بکات پێش دەستپێکردنی ساڵی نوێی خوێندن لە زانکۆ، کەمێک گەشت بکات و دونیا ببینێت. بە درێژای ماوەی مۆڵەتەکەی لە سەنگاپور کاریکرد و لە ئوستراليا وەرزشی کابۆیی خوێند و هەروەها پشووەکەی لە هاوایی و فیجی بەسەر برد، دواتر ڕۆشتە کالیفۆرنیا لە یەکەی گواستنەوەی گوێرەکە و لە لەوەڕگادا کاری دەکرد، لە درێژەی گەشتەکەیدا لە ئەمریکا بەردەوام لە لەوەڕگادا کاری دەکرد، لە کۆتاییدا گەڕایەوە بۆ بەریتانیا.

پێش دەستپێکی خوێندنی زانکۆ ئیدوارد بڕیاری دا لەگەڵ خوێندنەکەیدا هەوڵبدات کۆمەڵگایەکی فێرکاری نوێ درووست بکات، لە کۆمەڵێک یانەی وەرزشی زانکۆدا یاری بکات، کۆمەڵێک هاوڕێی باش پەیدا بکات و بە کورتی کاتێکی خۆش بەسەربەرێت!

### لە زانکۆی کامبرج

هەر لە سەرەتاوە لە زەمینەی وەرزشدا سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێنا، ئەو لە یانەکانی فوتبۆڵ، تێنس و ئیسکواش یاری کرد، لە زەمینەی ئەنجومەنی خوێندکاراندا وەکو کەسێکی سەرکەوتووی زۆر چالاک ناسێندرا، چونکە لەگەڵ بوونی ئەنجومەنی هەلی کاری گەنجان، کە لە ئەوروپا گەورەترین گروپێک بوو لەو بوارەدا، داوایلێکرا تا سەرۆکایەتی ئەنجومەنی نیس لە ئەستۆ بگرێت، کۆمەڵگایەکی بەخشش و هاوکاریی ۳٦۰۰ کەسییە کە لە ژێر سەرۆکایەتی و دەسەڵاتی ئەودا ئەندامەکانی بوون بە

٤٥٠٠ کەس. ئەم ئەنجومەنە گەورەترین گروپ بوو لە مێژووی زانکۆیەکەدا. بە سەرنجدان بە کارە سەرکەوتووەکانی ئەو لەم دوو ئەنجومەنەیەدا، یەکێکی تر لە سەرۆکەکانی ئەنجومەنێکی دیکە داوای لە ئیدوارد کرد گروپێک بۆ بەڕێوبەرەکان درووست بکات و خودی ئیدواردیش سەرۆکایەتی گروپەکە بکات، ئەو ئەمکارەی ئەنجامدا و بوو بە سەرۆکی ئەنجومەنی بەڕێوبەران.

لە سەرەتادا بە شێوەیەکی ئەکادیمی لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر بارودۆخی (فێرخوازانی ناوەندی) ئەنجام دا و ئەم ڕاپۆرتەی خوارەوەی خستەوو:

ئەوان ١٢ بۆ ١٣ کاتژمێر کاتی خۆیان تەرخان دەکەن بۆ شرۆڤەی هەموو لێکۆڵینەوەکان و هەموو داواکارییەکان یاداشت دەکەن، هەموو ئەو کتێبانەی کە لەبەردەستیاندایە دەخوێننەوە، دواتر ٣ بۆ ٤ کاتژمێر کاتی خۆیان تەرخاندەکەن بۆ نوسینی ڕاپۆرتی توێژینەوەکەیان، هەندێک لە فێرخوازەکان دووبارە ڕاپۆرتەکانییان دادەڕێژنەوە، هەندێک کات هەفتەیەک تەرخان دەکەن بۆ نوسینی تەنها یەک ڕاپۆرت.

بە گەڕانەوە بۆ ئەزموونی خۆی لە تێچووی نوسینی لاواز و نمرەی کەم هێنان، ئیدوارد بڕیاری دا ٢ بۆ ٣ کاتژمێر، لە پێنج ڕۆژی هەفتەیەکدا بخوێنێتەوە.

بە درێژای ئەو سێ ساڵە بەشداری وتارگەلێکی گرنگم کرد و هەموو زانیارییەکانی پەیوەندیدارەکانم بە شێوەی وێنەی عەقڵی کورت کردەوە، ئەو ئامانجەم بۆ خۆم هێنایە دی کە هەر کاتێک داوای ڕاپۆرت و لێکۆڵینەوەی لێبکرێت دەڕۆم و ئەو وێنە عەقڵییەی کە لە زانیارییەکانی سەبارەت بە بابەتەکە هەمە یان ئەوەی کە واهەست دەکەم پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە دادەڕێژم و زیاتر لە

دوو ڕۆژ کاری لەسەر ناکەم. بیر لە بابەتەکە دەکەمەوە و بەشێوەیەکی عەقڵی لەسەر بابەتەکە کار دەکەم و دواتر بەخێرایی هەموو ئەو کتێبانەی کە پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە دەخوێنمەوە، ئەو زانیارییانەی کە پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە وێنەیەکی عەقڵی لێدرووست دەکەم، دوای ماوەیەک پشوودەدەم و وەرزش دەکەم و دواتر دەگەڕێمەوە و وێنەیەکی عەقڵی لە لێکۆڵینەوەکە درووست دەکەم. کاتێک ئامادەکردنی ڕاپۆرتەکە تەواو بوو، دووبارە چەند خولەکێک پشوو دەدەم و دواتر دادەنیشم و بۆ ماوەی ٤٥ خولەک ڕاپۆرتەکەم دەنوسم و تەواوی دەکەم. بەم تەکنیکە هەمیشە نمرەی باڵا و نایابم بەدەستهێناوە.

پێش تاقیکردنەوەکانی کۆتایی کامبرج، لەسەر بەنامەیەکی هاوشێوە کە یارمەتی فێرخوازی دەدا نمرەی A بەدەست بهێنێت، کاری دەکرد. دواتر لە شەش ئەزموونی کۆتایی بەشداری کرد، ئەنجامی تاقیکردنەوەکان چی بوون؟

## ئەنجامی تاقیکردنەوەکان:

لە یەکەمین تاقیکردنەوە وەرگیرا، ئەگەر چی وەرگرتن لە تاقیکردنەوەکە وادەردەکەوت ئاسان و سروشتی بێت، بەڵام لەم تاقیکردنەوەیە تایبەتەدا ئەنجامێکی زۆر گرنگ بوو چونکە پەنجا لە سەدی خوێندکاران دەرنەچوون و هیچیان نەیانتوانی نمرەی باڵا بەدەست بهێنن، لە دووەمین و سێیەین و چوارەمین تاقیکردنەوەدا سێ یەم و دووەم و یەکەمی بەدەستهێنا، لە تاقیکردنەوەی کۆتایی دوو قۆناغی یەکەمی نمرەی باڵای ئەستێرەداری کە بەرزترین نمرەیە لە زانکۆیەکەدا، بەدەستهێنا.

یەکسەر دوای تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ پێشنیار بۆ ئیدوارد کرا کە ببێت بە داهێنەری ستراتیژێکی کۆمپانیایەکی هەلی کاری نێودەوڵەتی. پیشەیەک بوو کە بە بۆچوونی زانکۆی کامبرجەوە یەکێک لە هەرە باشترین ئەو کارانەی کە دوای تەواوکردنی زانکۆ خوێندکار دەتوانێت بەدەستی بهێنێت. کورتەیەک لە نوسینەکانی ئیدوارد:

کامبرج زۆر نایاب بوو، ئەوەندە چانس یاوەرم بوو لەو ماوەیەدا شتگەلێکی زۆر فێرببم، دۆست و هاوڕێی زۆر و باش، ئەزمونێکی زۆر، چالاکی و وەرزشی زۆر و بەسوود، خۆشبەختی، سەرکەوتنی زۆر و سێ ساڵ تام و چێژێکی بێوێنە. جیاوازی سەرەکی لە نێوان من و ئەوانیتردا تەنها ئەوە بوو کە من دەمتوانی چۆن دەبێت بیربکەمەوە و چۆن دەتوانم سوود لە عەقڵ و مێشکم وەرگرم. من خوێندکارێک بووم کە هەمیشە نمرەکانم (B و C) بوون، پێش ئەوەی فێرببم کە چۆن دەتوانم نمرەی باڵا بەدەست بهێنم، من ئەو کارەم بەسەرکەوتووی ئەنجام دا و هەموو کەسێکی تریش دەتوانێت ئەنجامی بدات.

خوێنەری بەڕێز: ئایا ئێوەش ئەزموونێکتان لە چیرۆکی توانای عەقڵ هەیە؟ ئەگەر وەڵامەکەتان (بەڵێ) یە، تکایە ئەو وەڵامە بنێرن بۆ ئیمەیڵەکەی من، کە لە کۆتایی کتێبەکەدا ئیمەیڵ و ناونیشانی خۆمم بۆتان داناون.

بەشی دووەم

# مێشکی ئێوە زۆر لەوە بەتواناترە کە بیری لێدەکەنەوە

## پێداچوونەوە

- تێگەیشتنی مرۆڤ لە مێشکی خۆی
- زیاتر لە یەک مێشک
- پەیوەندیی ناوەکیی خانە خۆڵەمێشییە بچوکەکانی مێشک
- شێوازی تێگەیشتن: چاو – مێشک – دووربین
- شێوەی سێ ڕەهەندی وەکو مۆدێلێک بۆ مێشک
- IQ و هزری سروشتیی ئێوە
- منداڵی مرۆڤ – مۆدێلێک لە باشترین

لەم کۆتایانەدا پسپۆڕان هەوڵیاندا تەوژمی هەقیقی مێشک بدۆزنەوە، تا زیاتر زانیاریتان لە بواری مێشکتان هەبێت زیاتر دەتوانن توانا ناوازەکانی خۆتان بەدەستبهێنن.

## تێگەیشتنی مرۆڤ لە مێشکی خۆی

لەوکاتەوەی کە من بەشی سەرەتای کتێبی توانای عەقڵم سەبارەت بە مێشک نووسی، توێژینەوەگەلێک لەم زەمینەیەدا گەشتن بە داهێنان و دۆزینەوەگەلێکی نوێ و نایاب هەندێک کات زانیارییەکانی پێشووترت بەرپەرچ دەدەنەوە، لە بری ئەوەی کە بڵێین کە (تەنها لە ١٥٠ ساڵی ڕابردوو)دا بەشێوەیەکی سەرەکی ئەم بوارە پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە، ئێستا دەتوانین بڵێین بەشی سەرەکی مەعریفەی ئێمە لەو بوارەدا لە ٣٠ ساڵی ڕابردوودا بەدەست هاتوون، وادەردەکەوێت زۆر درەنگ بێت لەگەڵ ئەوەی کە ئێمە باوەڕمان وایە ژیان سێ ملیۆن و پێنج سەد هەزار ساڵە لەسەر زەویدا هەیە، بەهەرحاڵ لەیادتان بێت کە ئەم ٥٠٠ ساڵی ڕابردووە مرۆڤی پەی بە بەها و کاریگەریی مێشک برد.



شێوەی ژمارە ١. مێشکی مرۆڤ

لە ڕوانگەیەکی ترەوە ئەم بابەتە جێگەی سەرسوڕمانییە، وا خەیاڵ بکەن کە هیچ ئایدییایەک لە شوێنی مێشکتاندا نییە و هاوڕێیەکتان لێتان دەپرسێت: (ناوەندی هەست و سۆز، عاتیفە، بیرکردنەوە، یادگە، حەز و ئارەزووەکان لە کوێدان؟) ئێوە وەکو زۆر خەڵکی تر (کە ئەرستۆش یەکێک لەو خەڵکانە بوو) ڕەنگ بوو بەشێوەیەکی نیمچە لۆژیکی گەشتبێتن بەو ئاکامەی کە مێشکی ئێوە لەناو دڵ و لە جەستەتاندایە، چونکە لەم شوێنەوەیە کە ئێوە نیشانەی فیزیکی ڕاستەوخۆی چالاکییەکانی هزرتان بەشێوەیەکی ڕێکخراو و بەرجەستە هەستپێدەکەن.

تەنانەت ئێستاش کە ئێمە بە کۆمپیوتەر و میکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنی خەریکی توێژینەوەی ئەو شتەین کە دەبێت ئاڵۆزترین دیاردەبێت کە مرۆڤ تاکو ئێستا بەدوایدا گەڕاوە، هێشتاش دەبێت دانبەوەدا بنێم کە ئەندازەی گشتی ئەو زانیارییانەی کە تاوەکو ئەمڕۆ بەدەستم هێناون بە ئەگەرێکی زۆر، کەمترە لە یەک لە سەدی ئەو شتەی کە دەبێت بیزانین. ڕێک ئەو کاتەی کە وادەردەکەوێت تێستەکان کارکەردی مێشک بەشێوەیەکی تایبەت پشتڕاست دەکەنەوە، تێستێکی تر ئەنجامدەدرێت کە بەشێوازێکی تر دەیخاتە ڕوو یان لەگەڵ مرۆڤێکی تردا ڕووبەڕوو دەبینەوە کە مێشکێکی هەیە وادەکات پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانماندا بکەینەوە. ئێستا دەستکەوتی هەوڵەکانمان زانستێکە کە نیشانی

دەدات و دەیسەلمێنێت مێشکی مرۆڤ بەتواناترە لەوەی کە پێشووتر بیرمان لێدەکردەوە، مرۆڤێک کە خاوەند مێشکێکی ئاساییە، توانا و کارامەییەکی زۆر زیاتری هەیە لەوەی کە پێشووتر وێنامان دەکرد.

چەند نموونەیەک دەتوانێت ببێت بە یارمەتیدەرتان بۆئەوەی زیاتر لەم بابەتە تێبگەن.

زیاتر بەشە زانستییەکان لەگەڵ ئەوەی کە جیاوازییە ڕووکەشەکانیان لە ئاراستە و بوارەکانیاندا، هەموویان سەرقاڵ و نیگەرانن لەوەی کە مێشکی ناوەڕاست کام لەوانەیە، ئەوان بۆچوونێکی هاوبەشییان نییە. کیمیاگەراکان ئێستا خەریکی بونیادنانی مادەیەکی کیمیاییەکی ئاڵۆزن کە لە مێشکی ئێمەدا هەن و کاریگەریی دەخەنەسەر، بایۆلۆجیستەکان هەوڵدەدەن کارایی و ئەرکی بایۆلۆجیای مێشک بدۆزنەوە، فیزیازانەکان دەیانەوێت بە توێژینەوەکانیان لە دوورترین مەودای بۆشاییدا لێکچواندنێک بدۆزنەوە، دەرونناسان کۆششی ئەوە دەکەن بە وردی توێژینەوەی مێشک بکەن، ئەوان تاقیکردنەوە بە ئازارهێنەر دەزانن وەکو ئەوەی کاتێک کە هەوڵبدەین پەنجەمان بخەینە ناو قەترەی جیوەوە، بیرکاریزانەکان کە مۆدێلێکی نوێیان بۆ کۆمپیوتەرە ئاڵۆزەکان و تەنانەت بۆ جیهانیش داهێنا، هێشتا ناتوانن شێوازێک پەیدابکەن کە بە شێوەیەکی ڕێکخراو و سیستماتیک ئەرک و کارایی مێشک بۆ هەموو مرۆڤەکان و بەدرێژایی تەمەنیان بدۆزنەوە و نیشانی بدەن.

## زیاتر لە یەک مێشک

لەماوەی سی ساڵی توێژینەوەمدا گەشتم بەوەی کە ئێوە دوو مێشکی ستونیتان هەیە و ئەو دوانە بە ئەندازەیەکی جیاواز لە مەڵبەندی جیاوازی مێشکدا کار دەکەن، ئەو مۆدێلە شاراوەیانەی کە مێشکتان دەتوانێت دروستی بکات زۆر زیاترە لەو شتەی کە ئێمە لە کۆتایەکانی سالانی ١٩٦٠ دا خەیاڵمان لێدەکردەوە، مێشکی ئێوە بۆ ئەوەی بە زیندووی بمێنێتەوە پێویستی بە چەندین جۆری جیاواز خۆراک و مادەیە. شێوەی ژمارە ٢ ببینن.

لە تاقیکردنەوەکانی کالیفۆرنیا لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٦٠ و سەرەتاکانی ١٩٧٠ دا، لێکۆڵینەوەیەک دەستی پێکردبوو کە دەبوو مێژووی ناسینی ئێمە بۆ مێشکی مرۆڤ بگۆڕێت، لێکۆڵینەوەیەک کە بوە هۆی ئەوەی (ڕاجیر سپیری) لە دامەزراوەی تەکنەلۆجیای کالیفۆرنیا ببێت بە براوەی خەڵاتی نۆبڵ و (ڕۆبێرت ئۆرنستین) لەسەر کارەکەی لە زەمینەی شەپۆلی مێشک و دیاریکردنی ئەرکی مێشک ناوبانگییەکی گەورەی بەدەست هێنا، پرۆفیسۆر (ئێرەب زایدل) و هاوڕێیەکانی بەردەوامییاندا بە توێژینەوە لەو زەمینەیەدا لە دەیەکانی ١٩٨٠ دا.

کورتەی قسە ئەوەیە کە ئەنجامی توێژینەوەکانی سپیری و ئۆرنستین ئەوە بوو کە دوو لایەنی مێشکی ئێوە یان دوو توێژاڵی مۆغ کە لە ڕێگەی تۆڕێکی زۆر ئاڵۆزی پێچاوپێچ لە ڕیشاڵی

دەماریی کە پێکەوە بەستراون، بە ڕوونی پەیوەستن بە جۆری جیاواز لە چالاکییە عەقڵیەکانەوە.

لە زۆربەی خەڵکیدا توێژی مۆغی چەپ تایبەتە بە لۆجیک، زمان و وشە، ڕێکخستن، ژمارە، شتە یەک ڕەهەندییەکان و شیکردنەوە و ڕاڤە و هەندێکی تر، ئەم بەشە پەیوەستە بە چالاکییە ئەکادیمیکییەکانەوە، کاتێک مۆغی چەپ خەریکی ئەم جۆرە چالاکییانەیە، بەزۆری مۆغی لای ڕاست ئەوکاتە لە پشوداندایە یان لە شەپۆلی ئەلفا دایە، ئەم بەشە ئامادەی یارمەتیدانی مۆغی چەپە، مۆغی ڕاست پەیوەستە بە ڕیتم، وێنە، ڕەنگ، وێنا و خەیاڵ، ئاگایی میکانیکی، گشتاڵت و هەندێک کاری دیکە.

توێژینەوەکانی دواتر دەریانخست کاتێک کە خەڵکی هاندەدرێت بۆئەوەی لایەنێکی عەقڵی کە وادەردەکەوێت لاوازە، بەهێز بکاتەوە. ئەم گەشەسەندنە لە جیاتی ئەوەی ئەرکی مەڵبەندێکی تر کەمبکاتەوە، کاریگەرییەکی ئەرێنی دەکاتەسەر ئەوانە و دەبێتە هۆی ئەوەی کارایی عەقڵیی ئەو لایەنەش زیاتر بکات.

پرۆفیسۆر زایدل، بەردەوامی دا بە کارەکانی سپیری لە زانکۆی کالیفۆرنیا و گەشتە ئەنجامێکی چاوەڕواننەکراو و سەرنجڕاکێش، ئەو سەلماندی هەر لایەکی مێشک توانایەکەی زۆر لەوە زیاترە کە پێشتر بیری لێدەکرایەوە و هەر نیوەیەکی مێشک هەروەها دەتوانێت پانتاییەکی فراوان و ڕوون و دەقیقتر لە چالاکییە عەقڵییەکان ئەنجامبدات.

بەهەرحاڵ، لەسەرەتاوە وا دەردەکەوێت مێژووی ئەم داهێنانە نوێیانە قبوڵ ناکەن چونکە زیاتر مێشکە باڵاکان هاوخوانی لەگەڵ ئەم جۆرە مۆمۆدێلەدا نییە. ئەنیشتاین و بیریارە گەورەکانی تر وادەردەکەوێت زیاتر سوودیان لە مێشکۆڵەی چەپییان وەرگرتبێت لەکاتێکدا پیکاسۆ، ژنان و هونەرمەندان و موزیکزانانی گەورە زیاتر لە ژێر هەژموونی مێشۆڵەی ڕاستییان کاریان دەکرد.




شێوەی ژمارە ٢ . شێوەی هەر دوو بەشی مێشک لە پێشەوە و کار و ئەرکییان.

توێژینەوەی بەرفراوانتر و وردتر بوە هۆکاری دۆزینەوە ڕاستیگەلێکی سەرسوڕهێنەرتر: ئەنیشتاین لە وانەی فەرەنسی

دەرچوو و چالاکییەکانی وەکو خوێندنی ژەنیاریی، وێنەکێشان، یەخت و بەلەم، یارییە خەیاڵییەکانی ئەنجامدا.

ئەنیشتاین بە یارییە خەیاڵی و وێنایەکان لەسەر زۆربەی تیۆرییە گرنگە زانستییەکانی کاریکرد و ئەو تیۆرانەی سەلماند. هاوینی ڕۆژێک لەسەر گردێک دانیشتبوو و ئەندێشەی دەکرد. خەیاڵیکرد کە تیشکی ڕوناى تا دوورترین خاڵی جیهان دەڕوات و بە بینینی ئەوەی (بە شێوەیەکی لۆجیکی) گەڕاوەتەوە بۆ لای خۆر، گەشت بەوەی کە لە ڕاستیدا جیهان دەبێت چەماوە بێت و ئەزموون و تاقیکردنەوە لۆجیکییەکانی پێشووتری بەرپەرچدایەوە. ژمارەکان، هاوکێشەکان و وشەکان کە ئەو لە دیدگا نوێیەکەیدا سوودی لێبینی، تیۆری ڕێژەیی بۆ ئێمە دۆزییەوە. سیستەمێکی ڕێکخراو لە مێشکی چەپ و ڕاست.

هونەرمەندانی گەورە بەشێوەیەکی هاوشێوە لە تەواوی تواناکانی مێشکییان سوود وەردەگرن، لەبری ئەو پەراو و نامیلکانەی کە بە داستانی میوانداری شەرابخۆرەکان پڕبکرێتەوە و بە شێوەیەکی ناخواستە بنەخشێنرێتە سەر دەق بۆئەوەی ببێت بە شاکارێکی هونەری قەشەنگ، دەروازەکانی وەکو ئەمەی خوارەوە بەدەست هاتوون:

لانی کەم تا کاتژمێر شەشی بەیانی، حەڤدە ڕۆژم تەرخانکرد بۆ ڕەنگکردنی کۆتا وێنەی کە کێشان، چوار جۆری نارنجیم تێکەڵی

دوو جۆری زەرد کرد تا ئەو ڕەنگەی کە دەمەوێت درووستببێت کە لە گۆشەیەکی لای چەپی نیگارەکەمدا سوودی لێببینم، دەمویست جیاوازییەکی لەگەڵ خانوە پێچاوپێچەکانی گۆشەی خوارەوەی لای ڕاستی نیگارەکەدا هەبێت و بەمشێوەیە لای بینەر سەرنجڕاێشتر بێت. ئەمە نموونەیەکە کە نیشانیدەدات کە چەندێک چالاکی مێشکی چەپ دەتوانێت کاریگەریی بکاتەسەر ئەو چالاکییەکیانەی کە ئێمە پێمان وابوو تایبەتەن بە مێشکی ڕاست.

هەروەها لەگەڵ لێکۆڵینەوەکانی سپیری و ئۆرنستینشدا، بەڵگەگەلێکی ئەزموونی زۆر هەن کە جەختدەکەنەوە لەسەر کارایی گشتیی و هەقیقەتی مێژووی کاریگەرییەکانی ئەو دوو لایەنەی مێشک، زۆرێک لە (مێشکە گەورەکان) لە ڕاستیدا سوودیان لە تایبەتمەندی و توانایی هەردوولای مێشک بینیوە، کەسێک لەم هەزار ساڵی ڕابردووەدا ناوبانگی پەیداکرد کە نموونەیەکی بەرجەستەبوو و نیشانی دا کاتێک کە مرۆڤ هاوزەمان لەگەڵ یەکدا لەسەر هەردوو لای بەشی مێشکی کار دەکات و سوودی لێدەبینێت، دەتوانێت چی کارگەلێکی گرنگ و سەرنجڕاکێش ئەنجامبدات.

لیوناردۆ داڤینچی لە سەردەمی خۆیدا بەدڵنیاییەوە یەکێک بووە لە دەستەنگترین ئەو کەسانەی کە لەم بوارانەدا کاری کردووە:

هونەر، پەیکەرتاشی، فیزیۆلۆژی، ئەندازیار، تەلارسازی، میکانیک، ئاناتۆمی، فیزیا، کەشناسی، زەوی ناسی، دیزاینەر، فڕۆکەوان، .... هەروەها ئەو ئاوازدانەر و گۆرانی بێژ بوو، دەیتوانی سروودەکانی خۆی بە ڕیتم و ئاوازەوە بخوێنێتەوە. لەبری پۆلێنکردن و جیاکردنەوەی ئەم بوارە جیاوازانە بەتوانا شاراوەکانی هەموو ئەوانەی ڕێکخست و سیستماتیکی کرد. پەڕاو و دەفتەرە زانستییەکانی لیوناردۆ بە قەشەنگی پڕبوو بوون لە وێنە و نیگاری سێ ڕەهەندی، شاکاری نیگارە قەشەنگەکانی بەزۆری هاوشێوەی دیزاینی تەلارسازیین، پڕن لە تێکەڵەیەک لە، هێڵی ڕاستە و ڕاست، گۆشە و کەنار، پێوان و ژمارە لەگەڵ ژمێریاری، لۆجیک و ئەندازەگیری ورد.

کەواتە وادەردەکەوێت کاتێک کە خۆمان لە بوارێکی دیاریکراودا بە بەتوانا یان بەبێ توانا دەبینین، لە ڕاستیدا ئەو بەش و لایەنەی مێشکمان وەسفدەکەین کە بە سەرکەوتووی بەکارمان هێناون، یان سەبارەت بە بەشێکی مێشکمان قسەدەکەین کە هێشتا بۆ ئێمە شاراوەن و پەیمان بە گرنگییان نەبردووە یان بەکارمان نەهێناون یان هەوڵمان نەداوە بۆ ئەوەی پەرە بە تواناکانمان بدەین لەو بوارەدا، لایەنە جیاوازەکانی مێشک ئەگەر بەشێوەیەکی تەندرووست و زانستی ڕابهێنرێن سوودێکی زۆرمان پێدەبەخشن لە ژیانماندا.

## پەیوەندیی ناوەکیی ((خانە خۆڵەمێشییە بچوکەکانی مێشک))

## پارچە و پاژەکانی مێشک

دکتۆر دەیڤد سامویێلس لە دامەزراوەی ڤێزمان خەمڵاندنی کرد کە بە شێوەیەکی گشتی سەبارەت بە دامێنی چالاکییە سەرەکییەکانی مێشک، دەبێت بڵێین لە هەر خولەکێکدا لە نێوان ١٠٠ هەزار بۆ یەک ملیۆن پەرچەکرداری جیاوازی کیمیایی ئەنجامدەدرێت.

لە مێشکی ئێوەدا لانی کەم یەک تریلیۆن خانەی دەماریی جیا بوونی هەیە، کاتێک کە دەزانین کە هەر یەک لە خانە دەمارییەکان دەتوانێت بەشێوەیەکی زۆر جیاواز کاریگەریی بکاتە سەر یەک تا سەد هەزار خانە دەماری تر. ئەم ژمارەیە تەنانەت سەرنجڕاکێشتریش دەبێت کاتێک کە یەکەمین نوسینم سەبارت بە توانای عەقڵ لە ساڵی ١٩٧٤ بڵاوکردەوە، بە تازەیی دەرکەوتبوو کە ژمارەی گۆڕاوەکان ڕەنگە بە ئەندازەی یەکێک بێت کە هەشت سەد سفری هەبێت. بۆئەوەی تێبگەین کە چەندێک ئەم ژمارانە گەورەن، بەراوردی بکەن بە هاوکێشەیەکی بیرکاری سەبارەت بە جیهان، یەکێک لە بچوکترین گەردیلەکانی جیهان ئەتۆمە (تەماشای شێوەی

شەش بکەن) گەورەترین شتێک کە ئێمە بیناسین جیهانە (تەماشای شێوەی پێنج بکەن) دەتوانین پێشبینی ئەوە بکەین کە هەموو ئەتۆمەکانی درووستکەریی ئەو جیهانەی کە ئێمە دەیناسین، زۆر زۆرە: ١٠ لەگەڵ ١٠٠ سفر لەگەڵیدا، ژمارەی وێنە عەقڵییە ئەگەرییەکان لە یەک مێشکدا تەنانەت دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم ژمارەیە بچوکتریش دیاربێت. (تەماشای شێوەی ٣ و ٤ بکەن).

چەند ڕۆژ دوای بڵاوبوونەوەی کتێبی توانای عەقڵ، دکتۆر پیوتەر ئەنیخین لە زانکۆی مۆسکۆ کە ئەم چەند ساڵەی دوای توێژینەوەکانی تەرخانکردبوو بۆ شیکردنەوەی چۆنێتی چالاکی زانیارییەکانی مێشک، نیشانیدا کە ئەندازەی گشتی ئەم چالاکییە کیمیاییانە لە ژمارە یەک کە هەشت سەد سفری هەیە زۆر زیاترە و بەراوردێکی نزمی لە ئەندازەی گشتی خراوەتەڕوو. ئەو ژمارە نوێیەی کە ئەو خستییەڕوو، زۆر لەوە وردتر بوو لەو ژمارەیە چونکە ئامرازی ئەندازەگیری و زانستی ئەو زۆر زیاتر بوو، ئەم ژمارەیە یەکێک نەبوو کە هەشت سەد سفری هەبێت.

تایبەتمەندی فۆڕم یان ڕادەی نمرەی ئازادیی مێشک بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

ئەم ژمارەیە ئەوەندە گەورەیە کە ئەگەر بمانەوێت بینوسین دەبێت هێڵێکی درێژ لە ژمارە و سفر بکێشین، بە دەستنووسی

ئاسایی ئەم ژمارانە نزیکی زیاتر لە پێنج بۆ دە کیلۆمەتر درێژ دەبێت، بە وەها ژمارەیەکی خەملێندراو مێشک هەر وەکو پانتایی سندوقێک وایە کە تێیدا سەدان ملیۆن میلۆدی و ئاوازی جیاوازی تێدا هەلگرتبێت - کردار و وێنە یان هۆش - ی تێدایە، کە دەتوانن هەمیشە چالاک و کارا بن. هیچ کەسێک نەبووە و ناشبێت کە بتوانێت نزیکی بەکارهێنانی تەواوی مێشکی ببێتەوە، مێشکی مرۆڤ بێسنوور و ناکۆتایە. ئێمە هەرگیز ناگەین بە کۆتایی.

کتێبی توانای مێشکم بەم مەبەستەوە نوسی بۆئەوەی یارمەتیتان بدات تا ئەو ڕادەیەی کە دەتوانن زیاتر سوود لە سندوقی مێشکتان وەرگرن و بەکاری بەرن.

نموونە گەلێکی تری تواناکانی مێشک زۆر زۆرن، نموونەگەلێک لە کاری بەرجەستەکراوی یادگە و میمۆری زۆر بەتوانا و بڵند، کارگەلێکی بەرجەستەکراو کە توانای بەرفراوانی مێشک دەسەلمێنێت و کۆنترۆڵی سەرنجراکێشی جوڵەی جەستە و لەش و لار و کە هەموو یاسایەکان تێدەپەڕێنێت. خۆشبەختانە ئەمڕۆکە بەڵگە گەلێکی زۆر هەن کە بە تەواوەتی سەلمێندراون و دەتوانین سوودیان لێوەرگرین.

١٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠

شێوەی ژمارە ٣ . ژمارەی ئەتۆمەکان (یەکێک لە بچوکترین ئەو گردیلانەی کە ئێمە دەیناسین) لە دونیای زانراوەکاندا، (گەورەترین شتێک کە پەیمانپێبردبێت)

١٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,
٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ , ٠٠٠ ,

شێوەی ژمارە ٤ . لە کۆتایەکانی دەیەی ١٩٦٠ دا، ژمارەیەک لە فۆڕمە جیاوازەکانی ١،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠ ، توخمی جیای دەماری، پسپۆڕێک خەملاندنی کردبوو کە هەشت سەد سفری هەیە، دۆزینەوە تازەکان و پێشکەوتنی زانست ئەوەی سەلماندووە کە تەنانەت ئەم ژمارەیە زۆر بچوکە!




شێوەی ژمارە ٥ . ئەندازەی گەورەی گەردوونی زانراو، هەر گۆیەکی بەدەوای یەکدا هاتوو شێوەیەکی هەزار ملیۆن دووجا گەورەترە لە شێوەی پێشووتری، بۆئەوەی باشتر تێبگەن چۆن دەتوانن سوود لەم شێوەیە وەرگرن و ئەوە بەراورد بکەن بە ژمارەی دروستکراوەکانی بیر و هۆش لە لایەن مێشکەوە.

شێوەی ژمارە ٦ . یەکێک لە بچوکترین ئەو شتانەی کە درکی پێکراوە لە سەر نوکی نینۆکی پەنجەی هەر مرۆڤێک بە ترلیۆن ئەتۆم بوونی هەیە و لە هەموو جیهاندا دەتوانرێت ١٠ لەگەڵ ١٠٠ سفر ئەتۆمی هەبێت.



بۆ زیاتر تێگەیشتن لە پەیوەندی نێوان ئەم ڕاستییە و تۆڕی پەیوەندیی مێشک، تەماشای شێوەی ٣ و ٤ بکە و لێکیبدەرەوە.

## شێوازی تێگەیشتن: چاو – مێشک – دووربین

لە پێشدا ڕێگەبدەن سیستەمی چاو/ مێشک/ دووربین شیبکەینەوە. لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٥٠ دا، دووربین مۆدێلێکی لە درک و شێوەی عەقڵی ئێمە خستەڕوو. لینز (هاوێنە)ی هاوشێوەی لینزەکانی چاو و لە ڕاستیدا وەکو شێوەی ڕووی مێشکن. شێوەی (ژمارە ٧ تەماشا بکەن) ماوەیەک ئەم تێگەیشتنە بوە جێگای سەرنج بەڵام دەرکەوت شێوەیەکی درووست لە مێشکی ئێمە نیشاننادات. ئێوە دەتوانن بۆ بە هەڵەخستنەوەی ئەم مۆدێلە ئەم تاقیکردنەوەی خوارەوە ئەنجام بدەن: وەکو ئەو کەسەی کە خەیاڵ بکات، **چاوەکانتان دابخەن**، سەبارەت بە بابەت و شتێک کە حەزتان لێیەتی بیربکەنەوە، کاتێک بە شێوەیەکی ڕوون وێنەکەی لە چاوی

دەروونیتانەوە (خەیاڵتان)دا جێگیر بوو، ئەم چالاکییەی خوارەوە ئەنجام بدەن.

*وێنەی شتێک لە مێشکتاندا دروست بکەن*

*ئەو شتە لە بەرامبەری خۆتانەوە بسوڕێنن*

*لە سەرەوە تەماشای شتەکە بکەن*

*لە ژێرەوە تەماشای بکەن*

*لانی کەم بۆ سێ جار ڕەنگی ئەو شتەی کە لە خەیاڵتاندا داتانناوە بگۆڕن*

*شتەکە دوور بکەنەوە و لە مەودایەکی دوورەوە سەیری بکەن*

*دووبارە شتەکە نزیک بکەنەوە*

*شتەکە گەورە بکەنەوە*

*شتەکە بە تەواوەتی بگۆڕن*

*شتەکە بسڕنەوە و لایبەن*

*دووبارە بیهێننەوە دۆخی سەرەتای خۆی*

ئێوە دەتوانن ئەم کارە گەورانە بە شێوەیەکی زۆر دروست ئەنجام بدەن بەبێ ئەوەی دووچاری سەختییەکی زۆر بین، ئامادەسازی و تواناکانی ئەم دووربینە تەنانەت ناتوانێت ئەم ئیشانەش بکات.

## شێوەی سێ ڕەهەندیی وەکو مۆدێلێک بۆ مێشک

خۆشبەختانە پێشکەوتنەکانی ئەم دوایەی تەکنەلۆجیا و زانست بوە هۆی ئەوەی کە ئامراز و کەرەستەیەکی پێوانی زۆر باشترمان لەبەردەستدا بێت: هۆلۆگرام.

لەم تەکنیکەیەدا ڕوناکی یان تیشکی لیزەر بەشێوەیەکی جێگیر بەسەر دوو بەشدا دابەش دەبێت. نیوەی ئەو تیشکە دەدات لە شاشە (پەراو یان ڕوو)ەکە و لە کاتێکدا بەشەکەی تری لە شێوەکە دەگەڕێتەوە و دواتر بە ئاراستەی بەشەکەیتری تیشکەکەدا دەڕوات.



شێوەی ژمارە ٧ . بەپێچەوانەوەی بۆچوونی پێشووتر مێشک بەشێوەیەکی زۆر ئاڵۆزتر بە بەراورد بە دووربین کار دەکات.



شێوەی ژمارە ٨ . هۆلۆگرام – مۆدێلێکی گونجاوتر بۆ مێشکی فرە ڕەهەندیی ئێوە.

پەراوی تایبەتی هۆلۆگرام – ملیۆنان ئەو شتانەی کە بەر تیشک دەکەون، جێگیر و خەزندەکات. کاتێک کە ئەم پەراوە لەبەرامبەر تیشکی لیزەردا دەوەستێت کە بە ژمارەی جیاواز لەسەرییەوە ئاراستەدەکرێن، دووبارە شێوەی سەرەکی خۆی درووست دەکاتەوە. خاڵێکی گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە ئەو شێوەیەی کە درووست بووە ڕێک و تەخت نییە، بەڵکو بەتەواوەتی دوو هێندە بووەتەوە و شتێکی سێ ڕەهەندی (گۆشەنیگا)ی درووست کردووە کە لە فەزادا هەڵپەسێردراوە، ئەگەر لە سەر، ژێر، کەناریشەوە تەماشای بکەین، هەمانشێوە وادەردەکەوێت کە شتە ڕاستەکەیە.

تەنانەت لەوەش سەرسوڕهێنەرتر ئەوەی کە ئەگەر پەراوی هۆلۆگرافیکی ڕاستیی ٩٠ پلە بچەرخێنین، دەتوانیت ٩٠ شێوە لەسەر هەمان پەراو درووست بکەیت کە هیچ جۆرە بەریەککەوتنێکیان لەگەڵ یەکدا نییە.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی چییەتی ئەم دەستکەوتە گەورەیە، ئەگەر پەراوەکە بەدەستەوە بگرین و بە چەکوش بیکەین بە گەردیلەی بچوکترەوە، هەر بەشێک لەم پەراوە چارچە پارچە بوانە - کاتێک دەیخەینە بەردەم لیزەرێک بە شێوەیەکی تایبەت بەرەو لای دەچێت، هێشتا توانای ئەوەی هەیە شێوەیەکی سێ ڕەهەندی کامڵ و تەواو درووست بکات.

کەواتە هۆلۆگرام بەبەراورد بە دووربین باشتر و لۆجیکی ترە و چاکتر دەتوانێت کاری مێشک ڕوونبکاتەوە و بە شێوەیەکی پلەبەپلە و ڕێکخراو وێنایەک لە ئاڵۆزیی عەقڵ و هزرمان دەخاتەڕوو. بەڵام تەنانەت ئەم کەرەستە پێشکەوتووە تەکنەلۆجییەش هێشتا ناتوانێت تایبەتمەندی و توانا ناوازەکانی مێشکی مرۆڤ شرۆڤە و شیکار بکات. گومانی تێدانییە کە هۆلۆگرام زیاتر هاوشێوە و لێکچواندنی هەیە لە ماهییەتی سێ ڕەهەندی توانای خەیاڵی ئێمە، بەڵام تایبەتمەندیی سەیڤکردن و پاشەکەوتی زۆر لاوازترە بە بەراورد بەو ملیۆنان شێوەیەی کە مێشک دەتوانێت بە شێوەیەکی زۆر خێرا و لەناکاو لە چرکە ئاگاییدا بیهێنێتەوە یاد. هەروەها هۆلۆگرام ڕاوەستا و جێگیرە، ئەو ناتوانێت هیچ یەکێک لەو ڕاهێنانانەی کە لە

لاپەڕەکانی پێشووتردا ئاماژەمان بۆ کرد ئەنجام بدات کە دەرمانخست مێشک دەتوانێت بە ئاسانی ئەنجامییان بدات و هەروەها ئەو کارانەی کە بە شێوەیەکی پێشبینی نەکراو پەیوەندیی بە سیستەمێکی ئاڵۆزترەوە هەیە. تەنانەت ئەگەر هۆلۆگرام بتوانێت هەموو ئەم کارانە ئەنجام بدات هێشتا هەر نەیدەتوانی بەسەر ئەم کارەدا زاڵببێت، ئەویش: چاوەکانی خۆی دابخات و ئەو کارانەی کە داوایلێدەکرێت ئەنجام بدات.

**بەهرەی هزری (IQ) و هزری سروشتیی ئێوە**

ئەوان دەڵێن تێستەکانی بەهرەی هزری (هزری بێسنوور) ئەندازەی ئێمە دەگرێت، جیا لەوەی کە ئیمتیازی بەهرەی هزری تەنانەت بە بڕێکی کەمی ڕاهێنانی چاکی ئاراستەکراو دەتوانێت بەشێوەیەکی چاوەڕوانکراو بگۆڕدرێت، بابەتگەلێکی تریش دژ بەم تێستانە خراوەتەڕوو.

یەکەم ئەوەی کە لێکۆڵینەوەی (بیر کیلیری) سەبارەت بە تواناکان دەریخست کەسێک کە بەهرەی هزری نیشاندەری IQ ی باڵا بێت، ناتوانێت بە ناچاریی : سەربەخۆ لە فیکر، سەربەخۆ لە کردار، بوونی هەستی قسەخۆشی و گاڵتەچێتی و ویستی ئەوە، جوانپەسەندی، لۆجیکی، ڕێژەگەرایی، توانایی لە چێژبینین لە شتە ئاڵۆز و نوێیەکان، داهێنەری، بەتەواوەتی پڕ لە زانیاریی، خۆش بەیان و زمان پاراو، نەرمی نواندن، یان زرنگی بێت.

دووەم ئەوانەی کە باوەڕییان وایە بەهرەی هزری پانتاییەکی فراوان و ڕەها لە تواناکانی مرۆڤ ئەندازە دەگرێت، ئەوەیان لەبیرکردووە کە ئەم تێستە دەبێت سێ زەمینەی بنەڕەتی لەخۆبگرێت: ١) مێشک ٢) تێست ٣) ئەنجام، بەداخەوە بەرگریکەرانی بەهرەی هزری ئەوەندە مێشکیان بە تێست و ئەنجامەوە خەریک کردووە، کە ماهییەتی واقعی مێشکییان بە تەواوەتی بیرچووەتەوە.

ئەوان درکیان بەوە نەکردبوو کە تێستەکانی ئەوان توانا سەرەکی و بنەڕەتییەکانی مرۆڤ شرۆڤە ناکەن، بەڵکو ئامانجی ئەوان ئەندازەگیری کارکەردی فێرنەکردن و گەشەنەکردنی مرۆڤیانە، بیانووی ئەوان زیاتر وەکو بیانووەکانی هەڵسەنگاندن و خەملاندن ناواقعیین کە لە هەندێک وڵاتانی ڕۆژهەڵات ئەندازەی پێیەکانی ژنان لە کاتێکدا ئەندازەگیرییان دەکرد کە پێیەکانیان دەبەست بۆئەوەی بچوکتر بێتەوە. لە کاتی لە دایک بوونییەوە تا کاتێک نزیکدەبوونەوە لە باڵغییان پێیەکانییان بە باندج دەبەست، بەمکارەیان دەیانویست پێش بە گەشە و گەورەبوونیان بگرن و بۆئەوەی ببێتەهۆی ئەوەی پێیەکانییان جوان و ناسکتر دەرکەون.

بەهەرحاڵ وێنای ئەوەی کە ڕەهەندە بەدەستهاتووەکان لەم میتۆدەوە، ڕەهەندی سروشتی و بەتەواوەتی گەشەسەندوی جەستەیی نیشاندەدات بە هەمان ئەندازە نامەعقوڵە کە وێنا بکەین تێستەکانی هۆش و عەقڵ، ڕەهەندە سروشتییەکانی مێشکی ئێمە

ئەندازەگیری دەکات. مێشکی ئێمە، ڕێک وەکو پێی ژنانی ڕۆژهەڵات، بە پەروەردە و تێگەیشتنێکی نادرووستەوە بە باندج پێچراوە و کەواتە بە شێوەیەکی سروشتی گەشەی نەکردووە.

لە بەرگریکردن لە تێستەکانی هزر و عەقڵدا باشتروایە بگەڕێینەوە بۆ مێژوویەکەی، ئەوان وەکو میتۆد و تیۆرێک گەشەیان نەکرد و زۆربەی کات (عامەی خەڵکی لەبەرچاو نەگیران). دەروونناسی فەرەنسی (باینت) لە توێژینەوەکانیدا گەشت بەوەی ئەو منداڵانەی کە دەتوانن لە خوێندندا سەرکەوتن بە دەستبهێنن کە لە بوارە بەرزەکاندا بەردەوامبن، بە زۆری ئەو کەسانەن کە سەربە چینە باڵا و خۆشبەختەکانی کۆمەڵگان، ئەو باوەڕی وابوو ئەمە دادپەروەرانە نییە و لەبەرئەم هۆیەش یەکەمین تێستەکانی بەهرەی هزری ئامادەکرد تا هەر منداڵێک کە توانایییەکی هزری و عەقڵی گەشەسەندووی هەیە بتوانێت بەردەوام بێت لەسەر خوێندنەکەی، ئەم تێستانە یارمەتییەکی بێوێنە و چارەنووسسازی بۆ بەردەوام بوونی ئەو منداڵانەدا کە بەشێوەیەک لە شێوەکان بێبەش بوو بوون لە خوێندن.

تێستەکانی بەهرەی هزریی وەکو یارییەکان یان بوارەکانی تر بهێننەپێشچاو کە نیشانیدەدەن لە چەند زەمینەیەکی تایبەتدا گەشەی هزریی و عەقڵی مرۆڤ لە چ قۆناغێکی برەوسەندوو دایە. دواتر دەتوانرێت سوود لەم تێستانە وەربگیردرێت ئاستی پێشکەوتنی ئێستاکە لەم زەمینەیەدا ئەندازەبگرین و لێیەوە دەتوانین وەکو پایە

و بنەمایەکی سەرەکی بەهرەوەرگرین کە دەتوانێت چالاکییەکانی مێشکی ئێوە فراوانتر و باشتر بکاتەوە و گەشەی پێبدات و پلەی بەهرەی هزری بەشێوەیەکی گونجاو بەرزبکاتەوە.

## منداڵی مرۆڤ – مۆدێلێک لە باشترین

بابەتێکی دیکەی بەڵگە نەویست کە توانا و لێهاتووی عەقڵی مرۆڤ دەسەلمێنێت، ڕەفتار و گەشەی منداڵی مرۆڤەکانە، جیا لەوەی کە زۆرێک لە خەڵکی وا خەیاڵ دەکەن (بونەوەرێکی بچووک، بێ دەسەلات و بێ توانایە) ئەو بوونەوەرە توانای فێربوون و یادگە و هۆشێکی زۆر بەتوانا و بەرزی هەیە، کاری مێشکی منداڵا تەنانەت لە سەرەتاییترین قۆناغەکانی تەمەنیدا زۆر بەتواناتر و ئاڵۆزترە لە باشترین کۆمپوتەرەکانی دونیا.

هەموو منداڵان (جگە لە هەندێکی کەمیان نەبێت) لە دوو ساڵیدا دەتوانن قسە بکەن و زۆرێک لەوانە تەنانەت پێش دوو ساڵیش توانای ئەو کارەیان هەیە. ئەم بابەتە بە بەڵگە نەویستراو دەبینین چونکە پرۆسە جیهانییە و لە هەموو شوێنێک هەر وایە، بەڵام ئەگەر پرۆسەکە بە وردییەوە شیبکەینەوە، دەردەکەوێت زۆر ئاڵۆزترە.

هەوڵبدەن گوێ لە قسەی یەکێک بگرن کە هیچ لەو زمانەی کە ئەو قسەی پێدەکات نەزانن و زانیارییەکی زۆر کەمتان هەیە لەسەر ئەو بابەت و ئایدیاییانەی کە ئەو سەبارەتی بەو زمانەوە قسەی پێدەکات، ئەم کارە نەک تەنها هەر گرفتە بەڵکو لەبەرئەوەی

دەنگەکان تێکەڵ دەبن جیاوازی کردن و جیاکردنەوە و ناسینەوەی وشەکان زۆر گران و نارِوونە. بەڵام ئەو کەسانەی کە دەتوانن قسە بکەن، لەگەڵ زاڵبونیان بەسەر ئەم سەختییانەشدا دەتوانن وشە مانادار و بێماناکانیش لەیەکدی جیابکەنەوە و بیپارێزن و عەمباری بکەن. کاتێک ئەو گوێی لە دەنگ و وشەگەلێکی وەک ئەمە دەبێت (کوچکو چیکو اوووأە میزتلوللی لدرلینگ!) سەری سورِدەمێنێت چۆن لێیان تێبگات و مانایان بداتێ!

تونا و هێزی منداڵی بچووک لە فێربوونی زماندا رِووبەرِووی پرۆسەیەکی دەکاتەوە کە لەخۆگری کۆنترِۆڵی دەقیق و ورد یان درکێکی تایبەت لە رِیتم، بیرکاری، مۆسیقا، فیزیک، زمانناسی، پەیوەندیی شوێن، یادگە و میمۆری، یەک ئاوازی و یەک پارچەیی، ئیستاتیکا و رِێکخستن، هۆ و بەڵگە، بیرکردنەوەی مەنتقییە. کە مێشکۆڵەی راست و چەپی لە وشە هەیەتی.

ئەگەر هێشتا گومانتان لە توانا و هێزتان هەیە، ئەوە بهێننەوە یادی خۆتان کە تەنها خۆتان و نەک کەسی تر توانیوتانە خۆتان فێری زمان و ئاخاوتن بکەن، کەواتە نابێت هێرش بکەنە سەر شتێک کە شایستەی بەرگریلێکردن بێت.

### بۆ پێشەوە

لە رِاستیدا هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە مێشکی ئێوە دەتوانێت کارگەلێکی زۆر ئاڵۆزتر و سەختر لەوە ئەنجامبدات کە ئێوە بیری

لێدەکەنەوە و بەخەیاڵتاندا دێت، ئەمەی هەموو ئەمانەی دواتری کتێبەکە شیکردنەوە و ڕاڤەی ئەو بوار و زەمینەیانە دەکات کە دەتوانێت کارایی و باوەڕبەخۆبوونی ئێوە سەبارەت بە توانا عەقڵییەکانتان بەرز بکاتەوە.

## بەشی سێیەم

# چۆن دەتوانرێت عەقڵی مرۆڤ کۆنترۆڵ بکرێت

## پێداچوونەوە

* بۆچی کرداری عەقڵی مرۆڤ لەگەڵ لێهاتووی ئەودا هەماهەنگ نییە
* تەنها مرۆڤ!
* ڕێنمایی کرداری مێشک

قبوڵکردنی شکست و خۆبەدەستەوەدان تەنها لەبەرئەوەی کە ئێمە مرۆڤین کارێکی زۆر بێمانا و پوچە! ئێمە دەبێت ئاگاداری توانا و کارایی مێشکمان بین بۆئەوەی بتوانین بە باشترین شێوە سوود لە زۆرترین توانا باڵاکانی عەقڵمان وەرگرین و بەکاریبهێنین.

## بۆچی کرداری عەقڵی مرۆڤ لەگەڵ لێهاتووی ئەودا هەماهەنگ نییە

بە پێچەوانەوەی ئەو هەموو بەڵگانەی کە هەن، زۆرێک لە خەڵکی هێشتا گومانییان هەیە لە توانا لەبنەهاتووەکانی عەقڵی مرۆڤ، ئەوان دەڵێن کارایی مێشکی مرۆڤ لە وەرگرتنی بەڵگە و ڕاستییەکاندا لاوازە، بۆ وەڵامدانەوەی ئەم ڕەخنەیە، پرسیارنامەیەک سەبارەت بە هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤ خرایە ڕوو بۆئەوەی دەرکەوێت بزانین بۆچی لەم ئەندامە چالاکە بە باشی سوود وەرناگیردرێت، پرسیارەکان لە خوارەوە ئامادەکراون و لە ژێر هەر پرسیارێکدا لانی کەم ٩٥ لە سەدی وەڵامدانەوەکانیان ئامادەکراون، لەکاتی خوێندنەوەیدا بیر لە وەڵامەکانتان بکەنەوە.

- ئایا لە خوێندنگادا هیچ فێرکراون سەبارەت بە تواناکانی هزر و عەقڵتان، ئەوەی کە چۆن تێگەیشتن لە کارایی و چالاکی عەقڵ دەتوانێت یارمەتی زۆرتان بدات لە فێربوون و پاراستن و بیرکردنەوە و کۆکردنەوەی زانیارییەکاندا؟

وەڵام: نەخێر

- ئایا هیچ زانیارییەکتان هەیە لەسەر چۆنێتی کارکردنی یادگەتان؟

وەڵام: نەخێر

◆ ئایا زانیاریتان وەرگرتووە لەسەر جۆرەکانی تەکنیکی خوێندنەوە و ئەوەی کە چۆن دەتوانرێت لە بوارە جیاوازەکانی فێرکردندا یارمەتیتان بدات بۆ بەکارهێنان و سوود لێوەرگرتنی؟

وەڵام: نەخێر

◆ ئایا زانیارییتان هەیە لەسەر چۆنێتی تەرکیزکردن و چۆنێتی پاراستنی ئەو تەرکیزە لە کاتە پێویست و گرنگەکاندا؟

وەڵام: نەخێر

◆ ئایا زانیارییتان هەیە لەسەر هاندەر و پاڵنەرەکان، چۆنێتی کاریگەریی ئەوە لەسەر تواناییەکان و چۆنێتی سوودوەرگرتنی بە دڵخوازی خۆتان؟

وەڵام: نەخێر

◆ ئایا زانیاریتان هەیە لەسەر ماهییەت و چییەتی وشەکان و چەمکە سەرەکییەکان و چۆنێتی پەیوەستکردنی ئەوانە لەگەڵ یاداشتکردن و نوسین و شێوەکێشان و فۆرمپێدان ....؟

وەڵام: نەخێر

◆ ئایا زانیاریتان لەسەر بیرکردنەوە و هەڵهێنجان هەیە؟

وەڵام: نەخێر

◆ ئایا زانیاریتان لەسەر داهێنان هەیە؟

وەڵام: نەخێر

کەواتە وەڵامی ڕەخنەکان ڕوونبوویەوە، هۆکاری ئەوەی کە بۆچی کارایی مێشکی ئێمە لەگەڵ لێهاتوویەکانماندا هەماهەنگ نییە ئەوەیە کە زانیارییەکی باشمان پێنەدراوە لەسەر تواناکانی خۆمان و ئەوەی کە چۆن بتوانین سوود لە زۆرترین توانا و هێزی باڵای مێشکمان وەرگرین.

**تەنها مرۆڤ!**

لێکۆڵینەوەیەکی دیکە کە بەدرێژای سی ساڵی ڕابردوو لە زیاتر لە ٥٠ وڵاتی جیاوازدا ئەنجامم داوە، ئەوەیە کە داوام لە خەڵکی کردووە خۆیان بخەنە ئەم دۆخەی خوارەوە:

ئەوان کارەکەیان بە تەواوەتی ئەنجامداوە، بەڵام ئەنجامی کارەکەیان بەشێوەیەکی گشتی جێگەی ڕەزامەندی نییە. هەوڵدەدەن بەرپرسیارێتی کارەکەیان نەگرنەئەستۆ لەو بەهانە و بیانوانەی کە هەمیشە دەیانگووت وەکو بۆچی فڵان کەس لەکاتی خۆیدا بەریدەکەی نەگەیاند، دەبوو ڕێک لەوکاتە گرنگەدا من نەخۆش کەوتبێتم و بڕۆشتبایەم بۆ لای دکتۆر، ئەمە هەڵەی ئەوان بوو، ئەگەر سیستەمی هاتن و چوون و پەیوەندییەکان لە کۆمپانیایەکەدا باش بوایە هەموو شتێک بەباشی دەڕۆشت بەڕێوە، بەڕێوبەر مۆڵەتم نادات کارەکانی خۆم بەو ڕێگایەی کە خۆم دەمەوێت ئەنجامی بدەم و هەندێک کەسیش ئەوە دەقۆزنەوە.

دواتر داوایانلێکرا واخەیاڵ بکەن کە لەگەڵ ئەو هەموو بیانووە زیرەکانەیەی کە هێناوتانەتەوە، کەوتونەتە تەنگانەوە و دەبێت دانبەوەدا بنێن کە هەموو ئەم ڕووداوانە بەهۆی ئێوەوە بووە.

لە کۆتایشدا داوایانلێکرا کە بەرپرسیارێتی هەموو ئەو شکستانە بە تەواوکردنی ئەو ڕستەیەی کە زۆرجار خەڵکی لەوەها دۆخێکدا دەیڵێن، بگرنە ئەستۆ. ئەویش: ((زۆر چاکە، تۆ ڕاست دەکەیت، هەمووی هەڵەی من بوو، بەڵام من ......))

لە هەموو ئەو گروپ و کۆمەڵانەی کە خرابوونە توێژینەوەکەوە لە هەموو وڵات و هەموو زمان و نەتەوەکاندا، گوزارشت و دەستەواژەیەکی هاوشێوەیان بۆ تەواوکردنی وشەکە بەکاردەهێنا: ((منیش مرۆڤم.))

ڕەنگە لەسەرەتاوە وا دەرکەوێت کە پێکەنیناوییە، بەڵام ئەم لێکۆڵینەوە و بەدواداچونە، خەیاڵ و وێنا و باوەڕێکی جیهانی و بەتەواوەتی نادرووست پێچەوانەکەکاتەوە، لە بنەڕەتدا مرۆڤ تا ئاستێک لاواز و بێتوانایە و لەبەرئەم هۆکارەیە کە مرۆڤ کۆمەڵێکی زۆر لە هەڵە و شکست ئەزمون دەکات.

بۆئەوەی تێگەیشتنێکی دیکە لەو سیناریۆیەی کە لەسەرەوە باسمانکرد بەدەستبهێنین، ئەم بارودۆخە لەبەرچاوبگرن: ئێوە کارێکی ناوازەتان ئەنجامداوە و بەردەوام پەیوەندیتان پێوەدەکەن و پێتان دەڵێن کەسێکی (زۆر ناوازە و کەم وێنە، بەتوانا، زیرەک و لێهاتوو)ن، کارەکەی ئێوە بە کارێکی (موعجیزە ئاسا، کارێک کە تا

ئێستا لە کەسیان نەبینیوە، بیۆێنە، جێگای سەرسوڕمان)ی بزانن، لە سەرەتاوە وەکو شتێکی ئاسایی و باو تەماشای دەکەیت، دواتر بەخۆت دەڵێیت بەڵی ئەوە منم لە هەموویان باشترم. چەندین جار لە خۆتان یان دەوروبەرتان بینییوە کە زۆر بە لەخۆباییانەوە وەستاون و گووتوتانە: ((بەڵێ! من مرۆڤێکی بەتوانام، من لێهاتووم و ئەو کارەی کە ئەنجامم دا زۆر ناوازە و کەموێنەیە، ئەوەندە ناوازەیە کە تەنانەت بوە بەجێگەی سەرسوڕمانی خۆشم! هۆکارەکەی ئەوەیە من مرۆڤێکی کامڵم!))

ڕەنگە هەرگیز .....

سیناریۆی دووەم سروشتی تر و گونجاوترە لەوەی پێشووتر. مرۆڤ بەهەمان شێوەی کە لە بەشی دووەمدا ڕوونمانکردەوە، بوونەوەێکی زۆر بەهێز و بەتوانا و بەقسەی زۆرێک لە خەڵکی دروستکراوێکی سەرسوڕهێنەرە.

هۆکاری سەرەکی هەڵە و شکستەکانی ئێمە ئەوە نییە کە ئێمە مرۆڤین بەڵکو ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لە قۆناغی سەرەتای گەشە و گەورەبونماندا هێشتا خەریکی هەنگاوی بچوک بچوکین، منداڵانە و لەسەرخۆیانە بەرەو درک و تێگەیشتنی ئامێری کۆمپیوتەرێکی ژیانی ناوازە و سەرسوڕهێنەر هەنگاو هەڵدەگرین، کە هەریەک لە ئێمە لە بوونماندا هەڵمانگرتووە.

هۆکاری ئەوەی کە سیستەمە خوێندنییەکانی دونیای ئێمە کاتێکی کەمی تەرخانکردووە بۆ لێکۆڵینەوەی شێوازی فێربوون،

ئەوەیە کە ئێمە وەکو مرۆڤ بنەما سەرەکییەکانی شێوازی کارکردنی کۆمپیوتەری ژیان فێرنەکراوین.

**بۆ پێشەوە**

**ڕێنمایی کرداری مێشک**

توانای عەقڵ یەکەمین (ڕێنمایی کرداری مێشک)ە، کە ئامانج لە دەرکەوتنی یارمەتیدانی ئێوەیە، بۆئەوەی ئامێری کۆمپیوتەری ژیانی خۆتان بناسن، گەورەی بکەن و فراوانی بکەن و پارێزگاری لێبکەن، هەموو جۆر و بوارە باڵاکانی توانا و لێهاتوویەکانی عەقڵتان ئاراستە و ئامانجدار بکات.

# بەشی چوارەم

# خێراتر و کاریگەرتر بخوێنینەوە

**پێداچوونەوە**

- گرفتی خوێندنەوە
- پێناسەی خوێندنەوە
- هۆکاری بوونی کێشە لە خوێندنەوەدا
- خوێندنەوە بە جوڵەی چاو
- باشییەکانی خێرا خوێندنەوە
- باوەڕگەلێکی ناڕاست سەبارەت بە خوێندنەوە
- تەکنیکە پێشکەوتووەکانی خوێندنەوە - خێرا و خێراتر
- ڕاهێنانی تواناکان
- فێرکردنی مترۆنۆم (ئامێری پێوانەکردنی کات)

ئەم بەشە ئێوە ئاشنادەکات بە دونیای قەشەنگ و جوانی خوێندنەوەی خێرا، لێرەدا فێردەبن کە زۆربەی ئەو باوەڕانەی پێشووتان سەبارەت بە خوێندنەوە هەڵە بووە. چۆن کێشە و گرفتە سەرەکییەکانمان لە زەمینەی خوێندنەوەدا چارەسەربکەین، چۆن سوود لەو تەکنیکانە وەربگرین کە خوێندنەوەمان خێراتر و

بەکاریگەرتر دەکاتەوە و لەگەڵیشیدا تێگەیشتن و درکمان بەرزدەکاتەوە.

## گرفتی خوێندنەوە

لە لاپەڕەی دواتردا، هەموو ئەو کێشانەی کە لە بواری خوێندنەوە و فێربوون و بیرچونەوەدا دووچارتان دەبێت، بینوسن: لەگەڵ خۆتاندا ڕاستگۆبن، تا زیاتر بتوانن کێشە و ئاریشەکانتان بخەنەڕوو، بەشێوەیەکی زۆر باشتر دەتوانن بەسەر گرفتی خوێندنەوە و فێربووندا زاڵبین.

مامۆستایان لە پانزە ساڵی ڕابردوودا بە وانە وتنەوەیان لە هەموو بابەتە جیاوازەکیاندا، گەشتن بەوەی کە گرفتگەلێکی هاوشێوە و چونیەکی گشتی بەردەوام ڕوودەدەن، لە خوارەوە لیستێک لە باوترین ئەو کێشانە خراونەتەڕوو، داواتان لێدەکەم لیستەکە بخوێننەوە و ئەو بابەتانەی کە کاریگەرییان زیاترە بۆ لیستەکە زیاد بکەن، ڕەنگە لە لیستەکەی ئێوەدا ئاماژە بە هۆکارگەلێکی کەمتر کرابێت.

| | | |
|---|---|---|
| بینین | ماندووبوونی دەروون و ڕۆح | تەرکیز |
| ترس | هەڵبژاردن | یاداشتکردن |
| زمان | کات | پاشەکشە |
| خێرای | شیکردنەوە و شرۆڤەکردن | لابردن و تێپەڕین |
| ماندووبوونی | جەستە گەڕانەوە و سڕینەوە | لە هەندێک بابەت |
| دروستبوونی دەنگەکان | قەبارە | توانای یادگە |
| درک و تێگەیشتن | ڕێکخستن | بیرهاتنەوە |

هەریەک لەو گرفت و کێشانەی سەرەوە گرنگ و بەکاریگەرن، دەتوانێت ڕێگری و بەربەست درووست بکات لەبەردەم خوێندن و فێربووندا، ئامانجی سەرەکی ئەم کتێبە دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەکە بۆ ئەم گرفتانە. لەسەرەتای ئەم بەشەدا بابەتە پەیوەندییدارەکان بە بینین، خێرایی، درک و تێگەیشت و کەشی فێربوون دەخرێنەڕوو.

پێش ئەوەی بچینە سەر لایەنە فیزیکییەکانی خوێندن، پێویستە لە سەرەتاوە پێناسەیەکی خوێندن بکەین و دواتر بە تێگەیشتن و

گەڕانەوە بۆ ئەو پێناسەیە دەبێت ڕونیبکەینەوە کە بۆچی زۆربەی زۆری ئەم گرفتانە لە هەموو جیهاندا بوونی هەیە.

**پێناسەی خوێندنەوە**

باشتروایە بۆ چەمکی خوێندن کە بە زۆری بەواتای (تێگەیشتن لە مەبەستی نوسەر) یان (قبوڵکردنی گوفتارە نوسراوەکان) پێناسەدەکرێت، پێناسەیەکی زۆر گشتگیرتر بخەینەڕوو، دەتوانین بەم شێوەیە واتای خوێندن لێکبدەینەوە: خوێندن پەیوەندیی تەواوەتی تاکە لەگەڵ زانیارییە هێما (ڕەمز) ییەکانە، ئەوە بەشێوەیەکی گشتی لایەنی بینینی فێربوونە و لەخۆگری ئەم حەوت قۆناغەی خوارەوەیە:

یەکەم: **ناسین**

زانینی خوێنەر لە نیشانەکانی ئەلف و بێ. ئەم قۆناغە ڕەنگە پێشئەوەی لایەنی فیزیکی خوێندن دەست پێبکات، درووست دەبێت.

دووەم: **شیکردنەوە**

پرۆسەیەکی فیزیکییە لەگەڵیدا سۆمای بینین لە وشەکانەوە پێچەوانە دەبێتەوە و چاو وەریدەگرێت و دواتر بەهۆی دەماریی بینینەوە پەیوەست دەبێت بە مێشکەوە. شێوەی ژمارە ٧ تەماشا بکەنەوە.

سێیەم: **یەکپارچەیی دەروونی**

هاوکێش و یەکپارچەیی تێگەیشتنێکی گشتییە و پەیوەستکراوە بە هەموو بەشەکانی زانیاریی و ئاماژە دەکات بە هەموو بەشە گونجاوەکانی ترەوە.

چوارەم: **یەکپارچەیی دەرەکی**

ئەم قۆناغە پەیوەستە بە شیکردنەوە و ڕاڤەکردن، ڕەخنەگرتن، هەڵسەنگاندن، هەڵبژاردن و ڕەدکردنەوەیە. پرۆسەیەکە کە تێیدا خوێنەر هەموو چوارچێوە زانیارییە ڕابردووەکانی خۆی لەگەڵ زانیارییە نوێیەکانی خۆی بەکاردەبات و پەیوەندییەکی گونجاو و ڕێکخراو لە نێوان ئەوانەدا درووست دەکات.

پێنجەم: **وزە و هێزی یادگە**

عەمباری سەرەکی زانیارییەکان و شوێنی خەزنکردنی هەموو ئەوشتانەی کە وەریدەگرین. عەمبارکردنی زانیاریی خۆی بۆخۆی بابەتێکە. زیاتر فێرخوازان لەو بارودۆخەدا خۆیان دەبیننەوە کە دەبێت بڕۆنە هۆڵی تاقیکردنەوەکانەوە و زیاتر زانیارییەکانیان بۆ کاتێکی دیاریکراویی دوو کاتژمێری خەزن و عەمبار بکەن! کەواتە عەمبارکردنی زانیارییەکان بەتەنها بەس نین و دەبێت خۆی کامڵ بکات لەگەڵ یادهێنانەوە و بیرکەوتنەوە.

شەشەم: **یادهێنانەوە و بیرهاتنەوە**

توانایی لە وەرگرتنەوەی زانیارییەکان لە کاتە پێویستییەکاندا لەو شوێنەی کە خەزنکراون و پارێزراون، ئەویش ئەوکاتەی کە پێویست بکات.

حەوتەم: **پەیوەندی**

بەکارهێنانی خێرا و کۆتایی لە زانیارییە وەرگیراوەکان کە لەخۆگری کۆمەڵێکی گرنگی وەکو بیرکردنەوەیە.

ئەم پێناسەیە لەخۆگری شیکردنەوەی زۆرێک لەو گرفتانە کە لە پێشەوە ئاماژەمان بۆی کرد، تەنها ئەو کێشانە لە لیستەکەدا نەهێنران کە تا ئاستێک لە دەرەوەی پرۆسەی خوێندندان، بوارگەلێکی وەکو کاریگەریی پەرچەکردار و کاردانەوەی ئێمە بە کەشی دەوروبەرمان، کاتی ڕۆژ، ئاستی وزە و توانای جەستەیی، حەز و ئارەزوو، بەهرە، تەمەن و لە بارودۆخێکی چالاکی جەستەییدابوون.

## هۆکاری بوونی کێشە لە خوێندنەوەدا

ئێستا ڕەنگە پرسیاری ئەوە بکەن بۆچی هەندێک کەس لەکاتی خوێندندا دوچاری گرفت دەبنەوە، وەڵامەکەی جگە لەوەی کە بۆ لاوازی مەعریفەی خۆمان سەبارەت بە توانای مێشک دەگەڕێتەوە،

هەروەها تێڕوانینمان سەبارەت بە پەروەردەی سەرەتایی خوێندنیش هەڵەیە.

سادەترین ڕێگای فێرکردن سەرەتا پیتەکانی (ئەلف و بێ)یان فێردەکرێت، دواتر ئەو پیتانە لەگەڵ یاسا جیاوازەکانییانەوە یاددەهێنرێنەوە، دواتر دەنگەکان لەگەڵ بڕگە و شێوازی خوێندنەوەدا ڕێکدەخەن و سەرەنجام برگەکان دەبێتە هۆی درووستبوونی چەمک و ڕستە و زمان، لەم قۆناغە بەدواوە کتێبگەلێکی جیاواز بە فێرخوازان دەدرێت کە بە زۆری لە یەکەوە تا دە پۆلێنبەندی دەکرێن، کە بەدرێژایی ئەوەدا خێرایی خوێندنەوەیان بەرزدەبێتەوە، بەدرێژای ئەم پرۆسەی خوێندنە، فێرخوازەکە دەبێتە بە خوێنەرێکی خامۆش.

لە ڕێگای وانەوتنەوەی (تەماشابکە و بیلێرەوە) درووستکردنی کۆمەڵێک کارتە کە وێنەی لەسەرە، ناوی شتەکان بەشێوەیەکی زۆر ڕوون لەسەر پشتی کارتەکان نوسراون، کاتێک منداڵەکە ناوەکان و وێنەکانیان فێردەبێت، وێنەکان پێچەوانە دەکرێتەوە و وشەکان نیشانی منداڵەکان دەدرێت، کاتێک زمانی سەرەکی فێری منداڵەکە کرا، ڕێڕەوی پێشکەوتنی ئەو بە خوێندنەوەی کۆمەڵێک کتێبی پۆلێنکراو کە هاوشێوەی ئەو کتێبانەن کە لە ڕێگا و میتۆدی فۆنەتیکدا سوودمان لێدەبینی، منداڵەکە دەبێت بە خوێنەرێکی خامۆش.

خستنەڕووی دوو شێوەی گشتیی خوێندنەوە کە بەکورتی خستمانەڕوو، بەدڵنیاییەوە زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت، هەڵبەت بە دڵنیاییەوە زیاتر لە ٥٠ شێواز و میتۆدی جیاواز لە بەریتانیا و وڵاتانی ئەوروپا و دونیادا بوونی هەیە، کێشە و گرفتگەلێکی هاوشێوەش لە هەموو وڵاتێکدا درووست کردووە.

بەهەرحاڵ ئەو خاڵەی کە دەبێت سەبارەت بەم شێوازی خوێندنەوە بیخەینەڕوو ئەوە نییە کە ئەم ڕێگایە بۆ گەشتن بە ئامانجەکان بەس نین، بەڵکو بابەتی گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە وەها میتۆد و ڕێگایەک بۆ وانە وتنەوەی شێوازی خوێندنەوە بۆ هیچ منداڵێک گونجاو نییە و یارمەتی منداڵەکە نادات لە کاتی خوێندنەوەدا تێگەیشتن و درکێکی گشتی لەسەر وشەکان هەبێت.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پێناسەی خوێندنەوە، تێدەگەین کە ئەم میتۆدانەی خراونەتەڕوو بۆئەوەیە تەنها قۆناغی ناسین دابپۆشن و هەوڵێکە بە ئاراستەی شیکردنەوە و یەکپارچەیی ناوەکی، ئەم میتۆدانە ڕێڕەوێک نین بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی خێرایی، کات، قەبارە، توانا و وزوی یادگە، بیرهاتنەوە، هەڵبژاردن، ڕەدکردنەوە، یاداشتکردن، تەرکیز، ڕاڤە و خستنەڕوو، ڕەخنە، شیکردنەوە و لێکدانەوە، ڕێکخستن، ئەنگیزە و بەهرە، حەز و ئارەزوو، ماندووبوونی دەروونی و ڕۆحی، کەش و ژینگە، ماندووبوونی فیزیکی و جەستەی و ئەوانی تر.

کەواتە تێدەگەین بۆ ئەو کێشە و ئاریشانەی کە لە خوێندنەوەدا لە هەموو دونیادا ڕوودەدەن، پاساوگەلێک هەن.

گرنگە لێرەدا ئەوە یادبهێنمەوە کە ناسین زۆر بەکەمی وەکو گرفتێک دەخرێتەڕوو چونکە لە سالانی سەرەتایی چونە قوتابخانەدا بەشێوەیەکی جیاواز فێرخواز فێردەکرێت، هەموو ئەو کێشانەی تر کە خرانەڕوو بەدرێژایی پرۆسەی خوێندن چارەسەر نەکراون.

بەشەکانی دواتر چەند ڕێگا چارەیەک بۆ چارەسەرکردن و زالبوون بەسەر ئەم کێشانەیەدا دەخرێنەڕوو، ئەوەی ماوەتەوە لەم بەشەیەدا تایبەتکراوە بە جولەی چاوەکان، درک و خێرایی خوێندنەوە.




شێوەی ژمارە ٩ . چاو

**خوێندنەوە بە جوڵەی چاو**

کاتێک داوا لە خەڵکی دەکرێت کە بە ئاماژەی پەنجەکانییان جوڵە و خێرای چاوەکانییان لە کاتی خوێندنەوەدا نیشانبدەن و دەستی بخەنەسەر، زۆربەیان پەنجەکانییان لەسەر هێڵێکی ڕێک لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەکێشن و لە کۆتایی هێڵەکەوە بەخێرای پەنجەکانییان دەگەڕێننەوە بۆ خاڵی سەرەتای هێڵەکە، ئەوان بەشێوەیەکی سروشتی چارەکە چرکەیەک بۆ یەک چرکە کاتی خۆیان لەو هێڵەدا خەرجدەکەن.



شێوەی ژمارە ١٠ . جوڵەی گریمانەکراوی چاوەکان لە کاتی خوێندنەوەدا کە لە لێکۆڵینەوەی جوڵەی چاوی ئەو کاسانەی کە هیچ زانیارییەکییان لەو بارەیەوە نییە، بەدەست هاتووە. وا وێنا دەکرێت کە هەر هێڵێک لە کەمتر لە یەک چرکەدا بخوێنرێتەوە.

**خێرایی**

تەنانەت ئەگەر خێرای چاو ئەوەندەش خاو بێت هێڵکە لە یەک چرکەدا بخوێنێتەوە، وشەکان بەخێرای ٧٠٠ بۆ ٥٠٠ وشە لە

خولەکێکدا تەواودەبن، چونکە ناوەندی خێرایی خوێندن تەنانەت لە بابەتە ئاسانەکانیشدا ٢٤٠ وشەیە لە خولەکێکدا، دەتوانین بگەین بەو دەرەنجامەی کە تەنانەت لە کاتژمێرە کەمکراوە خەملێنراوەکانیشدا گریمانەی ئەوە دەکرێت کە چاو دەتوانێت زۆر خێراتر وشەکان تەواوبکەن.

**جوڵە**

ئەگەر چاوەکان بە ڕێگایەکی هێواش و لەسەرخۆ کە لە وێنەکەی پێشوودا پیشانمانداوە لەسەر هێڵەکە جوڵە بکات و بیانخوێنێتەوە ناتوانێت تێگەیشتنێکی باشی لە دەقەکە هەبێت، چونکە چاوەکان کاتێک شتەکان بە باشی دەبینێت کە بتوانێت چەند ساتێک تەرکیزیان بخاتەسەر. ئەگەر شتەکە وەستاو بێت دەبێت چاویش بێجوڵە بێت بۆئەوەی بەباشی بیبینێت و ئەگەر شتەکە لە دۆخی جوڵەکردندابێت دەبێت چاویش لەگەڵیدا بجوڵێت تا بتوانێت بیبینێت. تاقیکردنەوەیەکی سادە لەسەر خۆتان یان یەکێک لە هاوڕێیەکانتان ئەوە دەسەلمێنێت: پەنجەیەکتان بە بێ جوڵە لە بەرامبەری خۆتان دابنێن، ئێوە دەتوانن ئەم تاقیکردنەوەیە لەسەر چاوەکانی خۆتان ئەنجامبدەن یان تەماشای چاوەکانی هاوڕێیەکەتان بکەن کاتێک تەرکیزی کردووەتە سەر شتێک، چاوەکانی بە جێگیریی و وەستاوی ماونەتەوە. دواتر پەنجەتان

بەرز و نزم و ڕاست و چەپی پێبکەن و بە چاوەکانتان تەماشای بکەن. لە کۆتاشدا پەنجەتان بەرز و نزم و ڕاست و چەپ بکەن و چاوتان جێگیر و ڕێک لە یەک ئاراستە بوەستێنن یان لە پێش چاوتانەوە هەردوو دەستان بەیەکدا بدەن و هاوکات لەگەڵیدا بە هەردوو چاوتان تەماشای هەردوو دەستان بکەن (ئەگەر دەتوانن ئەم کارە سەختە بەسەرکەوتووی ئەنجام بدەن ئیمەیڵم بۆ بکەن و ئاگادارم بکەنەوە!) کاتێک کە شتەکە دەجوڵێت دەبێت چاویش لەگەڵیدا بجوڵێت بۆئەوەی بتوانێت وێنەیەکی ڕوونی لێبگرێت.

بە سەرنجدان بەوەی کە هەموو ئەم بابەتانە پەیوەندیی بە خوێندنەوەوە هەیە، ئەوە ڕوونە کە ئەگەر بڕیاروایە چاوەکان واتای وشەکان تێبگەن و وشەکان ڕاوەستا و بێجوڵە بن، دەبێت چاویش لەسەر هەر وشەیەک بوەستێت پێش ئەوەی وشەی پاش ئەوە بخوێنێتەوە. لەبری جوڵەکردن لەسەر هێڵی ڕێک و ساف (کە لە شێوەی ١٠ دا نیشانماندا) دەبێت چاوەکانیش لە ڕاستیدا لە پرۆسەیەکی وەستان و بازدانی خێرادا بجوڵێت.




شێوەی ژمارە ١١ . هێڵکارییەکە کە جوڵە و وەستانی چاوەکان لە کاتی خوێندنەوەدا دەخاتەڕوو، ئەمەی خوارەوە بخوێننەوە.

بازدانەکان ئەوەندە خێران کە نزیکەی دەتوانین بڵێین کاتێکی ئەوتۆ ناخایەنێت، بەڵام وەستانەکان لەسەر هەر وشەیەک نزیکەی ١/٤ بۆ ١/٢ چرکە دەخایەنێت. کەسێک کە بە شێوەیەکی ئاسایی یەک وشە یەک جار دەخوێنێتەوە و کەسێکیش کە پێویست بکات یەک وشە دووجار بخوێنێتەوە، لە ڕێگەی هاوکێشەیەکی بیرکاری سادەی چاوەوە دەتوانێت خێرایی خوێندنەوەی ئەو بە زۆری لە خوارەوەی ١٠٠ وشە لە خولەکێکدا بخەملێنین بەواتای ئەوەی کە ئەو ناتوانێت واتای هەندێک لەو وشانەی کە دەیخوێنێتەوە بە خێرای درکی بکات و قەبارەی خوێندنەوەی بەرزبکاتەوە.




شێوەی ژمارە ١٢ . هێڵکارییەک کە خوە خراپەکانی خوێندنەوە لەو خەڵکانەدا نیشان دەدات کە خێراییەکی نزمییان هەیە: یەکجار وشەکان دەخوێننەوە، بە گەڕانەوەیەکی ناخوود ئاگایانە، سەرگەردانی بینین، نەمانی ئاگایی لەسەر کاغەزەکە. ئەمەی خوارەوە بخوێننەوە.

ڕەنگە لە یەکەمین نیگا وادەربکەوێت کە ڕێگا چارەیەک بۆ ئەو کەسانە نییە کە خێرایی خوێندنەوەیان نزمە، بەڵام بەمشێوەیە نییە

و ئەوان دەتوانن سوود لە چەند شێوە و تەکنیکی جیاواز وەرگرن بۆ چارەسەرکردنی کێشە و ئاریشەکەیان.

**بەرزکردنەوەی خێرایی خوێندنەوە**

١) خێرایی گەڕانەوە بەسەر وشەکاندا دەبێت وازلێبهێنین، چونکە نەوەد لە سەدی خوێندنە بەپەلە و خاوەکان بەهۆی نیگەرانییەکانی خوێنەرەوەیە و بۆ تێگەیشتنی زیاتری بابەتەکە هیچ پێویستییەکی نییە. دە لە سەدی ئەو وشانەی کە دەبێت دووبارە لێتێبگەنەوە دەتوانن وەکو وێنەی عەقڵی دەرچن. ئەم وشانە لە بەشی ٧ و ٨ دا خراونەتەڕوو، یان دەتوانیت بە شێوەیەکی عەقڵی وێنەیەک لەوانە لە مێشکتاندا درووست بکەن، ڕاستی بکەنەوە و دواتر تەواوی بکەن.

٢) کاتی هەر جێگیرکردنێک دەتوانرێت کەمبکرێتەوە بۆ نزیکەی لانی کەم ١/٤ چرکە، نابێت خوێنەر نیگەران بێت و واخەیاڵ بکات کە ئەم کاتە زۆر کەمە چونکە چاویی ئەو توانایەی هەیە لە هەر ١/١٠ چرکەدا نزیکەی ٥ وشە جێگیر و خەزنبکات.

٣) ئەندازەی جێگیرکردن و خەزنکردن دەتوانێت گەشەبکات بۆئەوەی مێشک بتوانێت ٥ وشە لە لەحزەیەکدا جێگیربکات.




شێوەی ژمارە ١٣ . هێڵکارییەک کە جوڵەی چاوی خوێنەرێکی بەتوانا و کاریگەر و سەرکەوتووتر نیشاندەدات، وشەگەلێکی زیاتر بۆ جێگیرکردن لە چاوەکانییەوە دەنێرێت بۆ مێشکی و پەلەکردن و خاوکردن و سەرگەردانییەکانی کەمیکردووە.

ئەگەر ئەو گریمانەیە درووست بهێنینە پێش چاوی خۆمان، کە مێشک لە هەر ساتێکدا پەیوەندیی لەگەڵ وشەیەکدا درووست دەکات، ئەم ڕێگا چارەیە لە سەرەتاوە ئەستەم دەرەکەوێت، لە ڕاستیدا دەتوانین بەشێوەیەکی گونجاو لەسەر کۆمەڵێک وشە تەرکیز بکەین کە دەتوانین بڵێین لە هەموو میتۆدەکانی تر باشترە: کاتێک ڕستەیەک دەخوێنینەوە نامانەوێت واتای دانە دانەی وشەکان درک بکەین بەڵکو ئامانجی سەرەکیمان ئەوەیە کە واتای گشتی ئەو وشانە بزانین کە دەیخوێنینەوە و لە ڕستەکەی تێبگەین.

بۆ نموونە وشەکانی ژێرەوە بخوێننەوە.

**ئەو　　　پشیلەیە　　　دانیشت　　　لەسەر**

وشەی شەقام کێشە و گرفتترە لە خوێندنەوەی ئەو ڕستەیەی کە دەڵێت ئەو پشیلەیە دانیشت لەسەر شەقامەکە.

کەسێک کە خێرایی خوێندنەوەی نزمە بە بەراورد بە کەسێک کە لە کاتی خوێندنەوەدا زۆر چالاکتر و باشتر و خێراترە دەبێت زیاتر بیربکاتەوە، چونکە دەبێت واتای هەر وشەیەک لەگەڵ واتای ئەو وشانەی کە دوای ئەو دێن زیادبکات و بیخاتەسەر، لە نموونەکەی سەرەوەدا ئەمە بەرامبەرە بە خستنەسەری وشەیەکی تازەیە بۆ ٥ یان ٦ وشەی دیکە، خوێنەری چالاکتر وشەکان بۆ ئەو مانادارە و تەنها یەک وشەیەکی نوێ بۆ ئەو تازەیە.

**باشییەکانی خێرا خوێندنەوە**

یەکێک لە باشییەکانی بە پەلە خوێندنەوە ئەوەیە کە چاوەکانی مرۆڤ چالاکییەکی فیزیکی کەمتر لە هەر لاپەڕەیەکدا ئەنجام دەدەن، لەبری ئەوەی کە هاوشێوەی کەسێک کە خێراییەکی نزمی هەبێت، ژمارەی جارەکانی زیاتری بۆ نموونە ٥٠٠ جێگیرکردنی پایەدار لە هەر لاپەڕەیەکدا ئەنجام بدات، ئەو فێردەبێت ١٠٠ جێگیرکردن لە هەر لاپەڕەیەکدا ئەنجام بدات، ئەمەش زۆر کەمە و هەر ئەمەش وادەکات ماسولکەکانی چاوی کەمت دووچاری ماندووبوون بێن.

باشییەکی تری خێرا خوێندنەوە، ئەوەیە کە کەسی خێرا خوێنەرەوە، لە کاتی خوێندنەوەیەدا لەگەڵ ئەوەی کە سەرنجی ڕیتم و پرۆسەی خوێندنەوەکە دەدات، بە ئاسانیش واتا و ماناکان درک دەکات و ئەمە لە کاتێکدایە کە هەندێک هەن خێرایی خوێندنەوەیان نزمە چونکە بەردەوام خوێندنەوەکەیان دەپچڕێنن و دووبارە دەستی پێدەکەنەوە و ڕێگایەکی ناڕێکخراو و ناسیستماتک پێڕەو دەکەن لە خوێندنەوەیاندا، ئەگەرێکی زۆری ئەوەی هەیە ئەم

کەسانە لە ڕووی دەروونییەوە ماندووبن، تەرکیزیان نەمێنێت، لە ڕووی عەقڵییەوە لە خوێندنەوەدا بێ توانابن و واتای ئەوەی کە دەیخوێننەوە بەشێوەیەکی باش تێنگەن.

**باوەڕگەلێکی ناڕاست سەبارەت بە خوێندنەوە**

دەتوانین ئەوە بسەلمێنین کە زۆربەی باوەڕە پێشینەیەکان سەبارەت بە خێرا خوێندنەوە نا درووست و تا ڕاستن.

**دەبێت وشەکان دانە بە دانە بخوێنرێنەوە:**

باوەڕێکی ناڕاستە، چونکە ئێمە دەتوانین لە کاتی خوێندنەوەدا بوەستین و ئامانجی سەرەکی خوێندنەوە تێگەیشتنە لە واتا و مەبەستی دەقەکان نەک وشەکان.

**ئەستەمە کە بتوانین زیاتر لە ٥٠٠ وشە لە خولەکێکدا بخوێنینەوە:**

باوەڕێکی ناڕاستە، چونکە ئێمە دەتوانین تا ٦ وشە لە هەر جێگیرکردنێکدا بخوێنینەوە و لە هەر چرکەیەکدا دەتوانین چوار جێگیرکردن و خەزنکردنێکمان هەبێت، کەواتە خێرایی ١٠٠٠ وشە لە خولەکێکدا بەتەواوەتی مەنتقی و گونجاو و ئاساییە.

**کەسێك کە بەخێرایی دەخوێنێتەوە، ناتوانێت تێبگات لە ماناکان:**

باوەڕێکی ناڕاستە، چونکە ئەو کەسانەی کە بەخێرایی دەخوێننەوە باشتر دەتوانن زاڵبن بەسەر مانا و واتای دەقەکاندا، زیاتر دەتوانن کۆنترۆڵی بابەتەکان بکەن، کاتێکی زیاتریان بۆ دەمێنێتەوە بۆئەوەی بپەرژێنە سەر ئەو بوار و زەمینەیانەی کە حەزیان لێیەتی و سەرنجییان ڕادەکێشێت، یان ئەو نوسین و دێڕانەی کە گرنگییەکی زۆری بۆیان هەیە.

**تا خێراتر بخوێنیتەوە تەرکیز کەمتر دەبێتەوە:**

باوەڕێکی ناڕاستە، چونکە هەرچی خێراتر بخوێنینەوە وزەیەکی جوڵاو و چالاکییەکی زیاتر وەردەگرین و تەرکیز و ئاگاییمان بەرزتریش دەبێتەوە.

**خێرایی ناوەندیی، باشترین جۆری خوێندنەوەیە:**

باوەڕێکی ناڕاستە، چونکە خێرایی ناوەندی لە خوێندنەوەدا سروشتی نییە. ئەوە ئەو خێراییەیە کە لەسەرەتاوە بەخراپی لەسەری فێرکراوین، زانیارییەکی پێویستتان لەسەر کاری چاو و مێشک لە خێرایی خوێندنەوەدا بەدەست نەهێناوە، ئەوە ئەو باوەڕە هەڵەیەیە کە لە مێشکتاندا چەسپاندویانە.

### تەکنیکە پێشکەوتووەکانی خوێندنەوە - خێرا و خێراتر

جگە لە ئامۆژگارییە گشتییەکانی سەرەوە، ڕەنگە هەندێک لە خەڵکی بتوانن سوود لەم زانیارییانەی خوارەوە وەربگرن، کە دەبێت لەگەڵ ڕاهێنەرێکی بە ئەزموونندا ڕاهێنان بکرێت.

### تەکنیکەکانی یارمەتی بینین:

کاتێک کە منداڵان فێری ئەوە دەبن بخوێننەوە بە زۆری پەنجەکانییان لەسەر نوسینەکە دادەگرن و لەکاتی خوێندنەکەدا پەنجەیان لەگەڵ چاویاندا بەسەر هێڵەکەدا دەجوڵێنن، ئێمە باوەڕمان وایە ئەم کارە کارێکی هەڵەیە و دەڵێین نابێت پەنجەکانییان بخەنە سەر لاپەڕەکە. ئەمڕۆکە دەرکەوتووە قسەکەی ئێمە هەڵە دەرچوو نەک ئیشەکەی ئەوان، لە بری ئەوەی داوایان لێبکەین پەنجەیان نەخەنە سەر لاپەڕە و نوسینەکە دەبێت داوایان لێبکەین جوڵانەوەی پەنجەکانییان خێراتر بکەنەوە، ئەوە ڕوونە کە پەنجەکانمان خێرایی چاو هێواش ناکاتەوە بەڵکو ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی یارمەتیمان بدات عادەتی ڕیتمێکی ئارام لە خوێندنەوەدا پەیڕەو بکەین کە هەماهەنگی دروستکردنە لە نێوان چا و پەنجە و بەمەش بایەخ و گرنگییەکەی زۆر ناوازە و کاریگەریی دەبێت.



شێوەی ژمارە ١٤ . شێوەی جوڵەی چاوێکە کە لەکاتی تەماشاکردنی بازنەیەکدا بە دەوریدا خولانەوەی درووستکردووە.

بۆ تێبینیکردنی جیاوازی نێوان خێرایی چاوی بە ڕیتم و بێ ڕیتم داوا لە هاوڕێیەکتان بکەن بازنەیەکی گەورەی باریک بهێنێتە پێش چاوی خۆیان و دواتر داوای لێبکەن بە ئارامی و هێواش و بە دیقەتەوە تەماشایی چواردەوری بازنەکە بکات. لە بری جوڵەکردن بە دەوری بازنەیەکی تەواودا، چاوەکانی سوود لە شێوازێک وەردەگرن کە زیاتر هاوشێوەی لاکێشە و درێژکۆڵەیین.

دواتر بە پەنجەکانی دەستان بازنەیەک لە هەوادا بکێشن و داوا لە هاوڕێیەکەتان بکەن کاتێک کە دەستتان بە ئارامی بە چواردەوری بازنە خەیاڵییەکەدا دەکێشن، تەماشای نوکی پەنجەتان بکات. سەرنجدەدەن کە چاوەکان بە شێوەیەکی نزیکەی تەواوەتی ڕێک بەدوای پەنجەتانەوەیە و بازنەیەکی وەکو ئەم وێنەیەی خوارەوە درووست دەکات.



شێوەی ژمارە ١٥ . شێوەیەک لە جوڵەی چاوی بە ڕیتم بە چوار دەوری بازنەیەکدا دەخاتەڕوو.

ئەم تاقیکردنەوە سادەیە هەروەها ئەوە نیشان دەدات کە ئەگەر زانیارییەکی بنەڕەتی سەبارەت بە کارایی فیزیکی چاو و مێشک بە مرۆڤ بدرێت دەتوانێت چەندێک کاراییەکەی باشتر بکاتەوە، لە زۆربەی کاتەکاندا پێویست بە تاقیکردنەوە و ڕاهێنانی تاقەت پڕۆکێن ناکات، ئەنجامەکان هەروەکو ئەمە بەخێرایی بەدەستدێن.

بۆ خوێنەر هیچ یاسا و سنورێک دانەنراوە ڕێگری بکات لەوەی کە پەنجەی ئاماژەکەی وەکو ئامرازێک بەکار نەهێنێت و وەکو زۆرێک لە خوێنەرە بەتواناکان دەتوانن پێنوس یان هەرشتێکی دیکە بگرنەدەستانەوە لە کاتی خوێندنەوەدا. لە سەرەتاوە وادەردەکەوێت بەهۆی یارمەتیدەرەکانی بینینەوە خێرایی خوێندنەوە نزمبێتەوە، ئێمە بەمشێوەیە بیردەکەینەوە چونکە خێرای خوێندنەوەمان بەرزتر لەوەی کە لە ڕاستیدا هەیە وێنا دەکەین، بەڵام لە ڕاستیدا

دەتوانرێت خێرای خوێندنەوە بەهۆی ئامرازە یارمەتیدەرەکانییەوە بەرزتر بکرێتەوە.

**تەرکیز زیادکردن**

بە تەکنیکەکانی کۆمەکی بینین خوێنەر دەتوانێت زیاتر لە یەک هێڵ لە هەر وەستان و جێگیرکردنێکدا بخوێنێتەوە، ئاشکرایە ئەم کارە لە ڕووی فیزیکییەوە ئەستەم نییە و تەنانەت لە دەقە ئاسان و سادەکان، کورتەی ئەنجامەکان و پێشەکیەکانیشدا گونجاوە، هەروەها ئەم میتۆدە خێرایی خوێندنەوەی بابەتەکان زیاتر دەکات، باشتر وایە هەمیشە سوود لە یارمەتیدەرێکی بینینی لە کاتی خوێندنەوەی ئەم جۆرە بابەتانەدا ببینین، چونکە بەبێ یارمەتی وەرگرتن لەم تەکنیکی کۆمەکی بینینانە چاوەکانمان حەزی ئەوەیان دەبێت بە ئاراستەیەکی زۆر کەم لەسەر لاپەڕەکە بگەڕێنەوە، مۆدێلە جیاوازەکانی یارمەتیدانی بینینی دەبێت لە پێشدا تاقیبکرێنەوە، کاریگەرەکەیان هەڵبژێردرێن.

**تێگەیشتن لە دەق و نوسین لەکاتی خێرا خوێندنەوەدا**

ئەم ڕاهێنانە ئاماژە دەکات بۆ لاپەڕە هەڵدانەوەی خێرا لە کاتی خوێندنەوەدا ئامانجی بینینی زۆرترین ژمارەی وشەکانە لە نوسیندا

و تێگەشتن لێی. ئەم جۆرە ڕاهێنانە توانایی خوێندنەوەی گروپە گەورەکانی وشەکان لە هەر وەستان و جێگیرکردنێکدا زیاد دەکات و بۆ تێگەیشتنی گشتی و شیکردنەوە بەسوودن، مێشک بە ڕاهێنانی گشتی و کاریگەر و خێرا خوێندنەوە پێش دەخات. ئەم تەکنیکە بۆ خوێندنەوە بە خێراییەکی زۆر دەتوانرێت بەراورد بکرێت بە لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل لە ڕێگای دەرەکی بە خێرای ١٢٠ کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا خەیاڵ بکەن بەم خێراییە لە ساتی لێخوڕیندان و لە ناکاو تابلۆیەکی هاتووچۆ لە ڕێگایەکەدا دەبینن کە لەسەری نوسراوە (بەخێرایی ٣٠ کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا لێبخوڕە.)، ئەگەر کەسێک دەستبخاتە سەر کیلۆمەتری ئۆتۆمۆبێلەکەت و پێت بڵێت (بەردەوام بە لەسەر لێخوڕینت و پێم بڵێ دەبێت چەندێک خێراییەکەت بێنیتە خوارەوە تا بگەیت بە ٣٠ کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا.) وەڵامەکە ٨٠ بۆ ٩٠ کیلۆمەترە لە کاتژمێرێکدا.

مێشک بە خێراییەکی زۆر بەرزتر ڕاهاتووە و ئەو خێراییە بۆ مێشک بوە بە شتێکی ئاسایی، بوونی شتە نوێیەکان بوەتەهۆی ئەوەی شتە ئاساییەکانی ڕابردوو کەم کەم لە بیربچنەوە، هەمان بابەت سەبارەت بە خوێندنەوەش ڕاستە و ئێوە بە ڕاهێنانی خوێندنەوە دەگەن بەوەی کە خێراییەکەتان دووئەوەندە بوەتەوە تەنانەت بەبێ ئەوەی ئاگاداری جیاوازییەکە ببن، مێشک بەشێوەیەکی سروشتی خۆی ڕادەهێنێتەوە.




شێوەی ژمارە ١٦ . ئەم وێنەیە نیشانی دەدات چۆن عەقڵمان خۆی رادێنێت بە خێرایی و جوڵەکردن، بە سوود وەرگرتن لەمە یارمەتیمان دەدات باشتر فێرببین.

## ڕاهێنانی توانایەکان

زیاتر لە کەشێکی ئارام و بێ دەنگدا دەخوێنینەوە، یەکەمین بابەتێکیش کە بوەتە هۆکاری ئەوەی کە زۆرێک لە وانەکانی تایبەت بە فێربوونی خێرا خوێندنەوە سەرکەوتن بەدەستبهێنێت، سوود وەرگرتنە لە هەل و دەرفەت. ڕاهێنانی و کارگەلێکی جیاواز بە

[1] ٦٠ کەم کەم خێراییەکە هێواش دەبێتەوە بۆ ئەوەی بگات بە ٣٠ کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا.

[2] ٣٠ تابلۆی ڕێنمایی بۆ کەمکردنەوەی خێرایی.

[3] خێرای ٩٠ کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا

فێرخوازان دەدرێت و داوایان لێدەکرێت دوای هەر ڕاهێنانێک خێرای خوێندنەوەیان لە ١٠ بۆ ٢٠ وشە لە خولەکێکدا بەرزبکەنەوە، کەواتە زۆربەیان بەدرێژایی خولی فێربونی خێندنەوە خێراییەکەیان ١٠٠ لە سەد بەرزتر دەبێتەوە، بەهەرحاڵ زۆربەی بەرزبوونەوەی خێرای خوێندنەوەکان بەهۆی ڕاهێنانەکانەوە نییە بەڵکو هۆکاری هەرە سەرەکی و بنەڕەتی ئەو ڕاستییەیە کە پاڵنەری فێرخوازان بەدرێژای خولەکە پلە بە پلە بەرزتر دەبێتەوە.

ئەم شێوازی خوێندنەوەیە بەو ئاراستە خێراییە دەبێتەهۆی ئەوەی فێرخواز چیتر باشتر و خێراتر بخوێنێتەوە، خێرایی کارایی مێشک لە کۆتایی خولی ڕاهێنانەکەدا ەکو ئەوەی لێدێت کاتێک کەسێک یاری شەڕە گا دەکات و گایەکە بەدواوەیەتی ١٠٠ مەتر لە کەمتر لە ١٠ چرکەدا دەبڕێت و لە کۆتایی دا دەبێت بەسەر حەسارێکی ١٨٠ سانتیمەتریدا بەرزبێتەوە چونکە گایەکە بەدواوەیەتی ئەم کارەش زۆر بە سەرکەوتووی ئەنجام دەدات. لەم جۆرە ڕاهێنانانەدا هۆکاری سەرەکی سەرکەوتن و بەرزبوونەوەی ئاست پەیوەندیی بە پاڵنەر و هاندەری ناوەکییەوە هەیە و خوێنەر بە سوود وەرگرتنێکی ئاگایانە سوود لە هەموو ئەزموونەکان وەردەگرێت و فێری دەبێت. ئەگەر بە تەواوەتی بڕیارماندابێت کە دەبێت ئەوپەڕی هەوڵی خۆمان بخەینەگەڕ، بە شێوەیەکی خۆنەویستانە کارەکەمان زۆر بە چاکی و باشی دەڕوات بەڕێوە.

خشتەی کۆتایی ئەم بەشە بۆ ئەو کەسانە ئامادەکراوە کە دەیانەوێت پێشکەوتنی خێرایی خوێندنەوەیان دیاریبکەن، بۆ ژماردنی ئەو وشانەی کە لە خولەکێکدا دەیخوێننەوە، ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدەن:

١) خولەکێک کتێبێک بخوێننەوە، خاڵی دەستپێک و کۆتایی خوێندنەوەکە لە خولەکەکەدا دیاریبکەن.

٢) ژمارەی وشەکانی سێ دێڕ (هێڵ) بژمێرن.

٣) ئەو ژمارەیە دابەشی سێ بکەن بۆئەوەی ناوەندیی وشەکانی هەر دێڕ (هێڵ)ێک بدۆزنەوە.

٤) ژمارەی ئەو دێڕانە بژمێرن کە لە خولەکێکدا خوێندوتانەتەوە.

٥) ناوەندی ژمارەیی وشەکانی هەر دێڕێک لێکدانی ژمارەی دێڕەکان بکەن، ئەو ژمارەیەی کە بەدەست دێت یەکسانە بە ژمارەی ئەو وشانەی کە لە خولەکێکدا دەیخوێننەوە.

**ئەم یاسایە جێبەجێبکەم:**

زانینی خێرایی خوێندنەوەتان = (ژمارەی وشەکان لە یەک لاپەڕەدا X ژمارەی لاپەڕەکان) / (ژمارەی ئەو خولەکانەی کە خەریکی خوێندنەوە بوون)

## فێرکردنی مترۆنۆم (ئامێری پێوانەکردنی کات)

مترۆنۆم کە بە زۆری بۆ پاراستنی ڕیتمی مۆسیقا بەکاردێت، هەروەها دەتوانرێت بۆ ڕاهێنانەکانی خوێندنەوە و خێرا خوێندنەوە سوودی لێوەرگیردرێت. ئەگەر لە کاتی خوێندنەوەدا خێراییەکی سروستی و مەنتقیت هەبێت، دەتوانیت لە هەر ڕیتمێکدا وەکو یارمەتیی بینین بەهرەی لێوەرگریت. بەم میتۆدە دەتوانن ڕیتمی ڕێکخراو و سیستماتیک و ئارام لە کاتی خوێندنەوەدا بەدەستبهێنن و بیپارێزن و ڕێگری بکەن لە کەمبوونەوە و خاوبوونەوەی خێرایی باو کە لە درێژەی خوێندنەوەدا دووچارتان دەبێت. کاتێک باشترین ڕیتم وەردەگرن دەتوانن خێرایی خوێندنەوەتان هەندێک کات بە زیادکردن و خستنەسەری ڕیتمێکی زیادە لە خولەکێکدا پەرەپێبدەن.

هەروەها دەتوانن سوود لە مترۆنۆم وەرگرن بۆ ڕێکخستنی ڕاهێنانی درککردن و تێگەیشتنی دەق لە کاتی خێرا خوێندنەوەدا، کە بە خێراییەکی نزم دەستپێدەکات و کەم کەم خێراییەکەی بەرزدەبێتەوە و تا شوێنێک کە دەتوانن بەیەک ڕیتم یەک لاپەڕە بخوێننەوە.

## بۆ پێشەوە

ئەو زانیارییانەی سەبارەت بە جوڵەی چاوەکان، یارمەتی بینین، تەکنیکە پێشکەوتووەکانی خوێندنەوە دەبێت لەلایەن خوێنەرەوە لە بارودۆخێکی لەباردا بەکاربهێندرێت. دەتوانین درک بەوە بکەین کە ئەم تەکنیک و ئامۆژگارییانە، کاتێک بەسوود و کاریگەرتر دەبن کە بیگونجێنن و ڕێکی بخەن لەگەڵ زانیارییەکانی بەشەکانی دواتر کە باسییان لێوە دەکەین.

# بەشی پێنجەم

# یـادگـــــه

**پێداچونەوە**

- پرسیارگەلێک سەبارەت بە یادگە
- وەڵامی تێستەکان و پرسیاری زیاتر
- یادهێنانەوە لە کاتی لەبەرکردندا
- یادهێنانەوە لەکاتی خوێندنەوەدا
- یادهێنانەوە دوای لەبەرکردن
- تەکنیکەکانی یادگە - بەدواداچوون و تیۆریی
- سیستەمە تایبەتییەکانی یادگە و چۆنێتی بەهێز کردنی
- توانایی بێوێنەی یادگە
- سیستەمی یادگە (ژمارە - ڕێکخستن)
- ئەرکێکی ئەستەم

لەم بەشەدا یادگەی فێربوون و درککردنی ئێوە تێست دەکرێت، دواتر سەبارەت بە سیستەمەکانی یادگە و سوود وەرگرتن لە یادگە و بەکارهێنانی وێنە و وشە بنەڕەتییەکان فێردەکرێن.

**پرسیارگەلێك سەبارەت بە یادگە**

**تێستی ژمارە ١ . یادهێناوە لە کاتی لەبەرکردن (فێربوون)**

لە لاپەڕەی دواتردا لیستێک لە وشە ئامادەکراوە، هەموو وشەکان یەکجار و بەخێرایی و یەک لە دوای یەک بخوێننەوە و دواتر لە لاپەڕەکانی دواتردا بۆ تێستی ژمارە یەک بۆشاییەکمان جێهێشتوە هەموو ئەو وشانەی کە بیرتان ماوە لەوێ بینوسن. ڕەنگە هەموو وشەکان لە مێشکتاندا نەمابێتەوە و هەندێکیتان بیرچوبێتەوە کەواتە دەبێت تەواوی هەوڵتان بخەنەگەڕ بۆئەوەی زۆرترین وشەتان بێتەوە یاد. جارێکیتر وشەکان یەک لە دوای یەک بخوێننەوە، بۆئەوەی کە دڵنییایی بدەن بە خۆتان کە کارەکە بە درووستی ئەنجام دەدەن، پارچە کاغەزێکی بچوک بگرنە دەستانەوە لەکاتی خوێندنەوەی هەموو وشەکانی لەسەر بنووسن.

**هەر ئێستا دەستپێبکەن.**

| | | |
|---|---|---|
| ڕۆشت | سپی | پله |
| ئەمە | و | یاداشت |
| کتێب | کاغەز | و |
| باش | لیوناردۆ داڤینشی | دەرکردن |

| | | |
|---|---|---|
| و | ڕوناکی | دەبێت |
| دەستپێکردن | لە | کات |
| لە | توانا | ماڵ |
| ئەمە | ئەمە | |
| درەنگ | خود | |

ئێستا لە لاپەڕەی دواتر کە شوێنێکمان جێهێشتوە وەڵامدانەوەی تێستی ژمارە یەک، وەڵامی ئەو شەش پرسیارە بدەنەوە.

## تێستی ژمارە ۲ . یادهێنانەوە لە کاتی خوێندنەوەدا

لە لاپەڕەی دواتردا بۆ تێستی ژمارە دوو، هێلکارییەکی خاڵی دانراوە، هێلکارییەکە بە هێڵێک تەواو بکەن کە نیشانی دەدات بیردەکەنەوە لە کاتی خوێندنەوەتاندا یادگە (حافیزە)تان چی قەبارەیەک لە بابەتەکە دێنێتەوە یاد. هێڵە ستونییەکەی لای ڕاست نیشانی دەدات کاتێک کە واز لە خوێندنەوە دێنین گەشتووین بەچی خاڵێک، هێڵی کۆتای نیشانی دەدات کە هیچ شتێکتان بیرنەماوە (لەبیرچونەوەی تەواوەتی) و هێڵی سەرەوە یادهێنانەوەی تەواوەتی نیشاندەدات (واتا هەموویتان بیرهاتووەتەوە).

لەم لاپەڕانەی خوارەوەدا سێ هێلکاری دەبینن کە لە لایەن سێ کەسەوە پڕکراونەتەوە، ئەم هێلکارییانە نیشانی دەدەن ئەوان چی وێنایەکییان بۆ قەبارەی بابەتی یادهێنانەوەیان لە یادگە (حافیزە)یان هەیە. ئەم هێلکارییانە بە ۷۰٪ دەستپێدەکەن چونکە واگریمانە دەکرێت کە تەنانەت باشترین ئەندازە و ئاستی فێربوون و یادهێنانەوەی درک و یادگەمان ناتوانێت ببێت بە ۱۰۰٪ . هەڵبەت هەڵبژاردنی تریش لەپێشە کەواتە کاتێک تەماشای ئەم هێلکارییانە

دەکەن، بگەڕێنەوە بۆ تێستی ژمارە ٢ و پڕی بکەنەوە بۆئەوەی بزانن چی چاوەڕوانییەکتان لە کارایی یادگەتان هەیە.

هێڵکاری ژمارە ١٧ . سێ هێڵکاری کە یادگە لە کاتی پرۆسەی فێربوون و یادهێنانەوە نیشاندەدات.




کەسی ( A ) کەسێکە کە باوەڕی وایە لەکاتی پرۆسەی یادهێنانەوە یادگەی جێگیر بووە. (واتا هەموو ئەو شتانەی کە لەبەری کردووە دەتوانێت بیهێنێتەوە یاد)



کەسی ( B ) کەسێکە کە باوەڕی وایە ئەو شتانەی کە لە سەرەتای پرۆسەکەوە فێربووە باشتر دەتوانێت بیهێنێتەوە یاد.




کەسی ( C ) کەسێکە کە باوەڕی وایە ئەو شتانەی کە لە کۆتایی پرۆسەکەوە فێربووە باشتر دەتوانێت بیهێنێتەوە یاد.

## تێستی ژمارە ٣ . یادهێنانەوە دوای لەبەرکردن

لە لاپەڕەکانی دواتردا لە هێڵکاری تێستی ژمارە سێدا، هێڵکارییەکی خاڵی هەیە کە نیشانی دەدات چی وێنایەکتان لە شێوازی کارایی یادگەتان هەیە، لە کاتێکدا کە پرۆسەی فێربوون کۆتایی دێت. هێڵە ستونییەکەی لای چەپ خاڵی کۆتایی فێربوون نیشان دەدات، هیچ هێڵێکی ستوونی لای ڕاستەوە نییە، چونکە وا گریمانە دەکرێت بەشێوەیەکی گشتی بابەتەکە دوای چەند ساڵێک نایاتەوە یادمان. هێڵی کۆتایی نیشانی دەدات هیچ یادهێنانەوەیەک ڕوونەداوە، بەرزترین هێڵیش باشترین و بەرزترین ئەندازە و ئاستی یادهێنانەوە و حافزەتان نیشاندەدات. ئەم هێڵکارییانە ئەوە

نیشاندەدەن کە تێڕوانینی ئەم سێ کەسە بۆ حافزە و یادگەیان دوای کۆتایی هاتنی پرۆسەی فێربوون، چییە.

هێڵکاری ژمارە ١٨ . ئەم هێڵکارییانەی خواروە کە دانراون بۆئەوەی یادگە و حافزەی دوای کۆتایی هاتنی پرۆسەی یادگیری نیشانبدەن.




کەسی ( A ) کەسێکە کە باوەڕی وایە هەموو بابەتەکانی لە ماوەی کاتی دیاریکراودا لەبیرچوەتەوە.



کەسی ( B ) کەسێکە کە باوەڕی وایە حافزە و یادگەی بۆ ماوەیەک بە پارێزگاری هێشتووەتەوە و دوای ماوەیەک بەشێوەیەکی سەرسڕمان بەرەو کەبوونەوە هاتووە.




کەسی ( C ) کەسێکە کە باوەڕی وایە حافزەی بۆ ماوەیەک بە جێگیری ماوەتەوە و دواتر بە خێرایی کەمێک دابەزیوە و دواتر لە خاڵێکی تایبەتدا بە جێگیریی ماوەتەوە.

هاوشێوەی تێستی ژمارە ٢ . نموونەگەلێکی زۆرتریش هەن، کەواتە هەر ئێستا بچنە سەر ڕاهێنانی تێستی ژمارە ٣ و هێڵکارییەکە بەشێوەیەک پڕبکەنەوە کە بەشێوەیەکی ورد و زانستیتر تێگەیشتن و هەستی ئێوە سەبارەت بە شێوازی فەرامۆشی بخاتەڕوو.

**وەڵامی تێستەکان و پرسیاری زیاتر**

**تێستی ژمارە ١ . یادهێنانەوە لە کاتی لەبەرکردندا**

لە کاتی وەڵامدانەوەی پرسیارەکان، تەماشای وەڵامەکان مەکەن، بۆئەوەی توانای خۆت بۆ دەرکەوێت.

١ – هەموو ئەو وشانەی کە دێتە یادت بە ڕێکی بینوسە.

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................

٢ – پێش ئەوەی یەکەم هەڵە بکەیت، چەند وشەت لە سەرەتای لیستەکەوە بە بیرهاتەوە؟

٣ – ئایا دەتوانیت ئەو شانە بهێنیتەیاد کە زیاتر لە یەکجار لە لیستەکەدا دووبارە بوونەتەوە؟ ئەگەر وەڵامەکەت بەڵێیە ئەوا بینوسە.

٤ – چەند وشەت لە پێنج وشەکەی کۆتای بیرماوە؟

٥ – ئایا وشەیەکت لە لیستەکەدا بیرماوە کە بەتەواوەتی جیاواز بوو لە شەکانی تر؟

٦ – چەند وشەتان لە ناوەڕاستی ستونەکە دەتوانن بهێننەوە یادی خۆتان کە لە وەڵامەکانی پێشووتردا نەهاتەوە یادتان؟

## تێستی ژمارە ٢ . یادهێنانەوە لە کاتی خوێندنەوەدا

بەهەمانشێوەی کە لە نمونەکانی شێوەی ژمارە ١٧ دا ڕونمانکردەوە، هێڵکارییەکە بە هێڵێک پڕبکەنەوە کە کارایی یادگە و حافزەتان لە کاتی پرۆسەی فێربووندا نیشانبدات.




## تێستی ژمارە ٣ . یادهێنانەوە دوای لەبەرکردن

هێڵکارییەکەی خوارەوە بە سەرنجدان بە شێوازی بیرکردنەوەتان لە کارایی یادگەتان دوای تەواوکردنی پرۆسەی یادهێنانەوە، پڕبکەنەوە. (تەماشای نموونەکانی شێوەی ١٨ بکەن)




((ئاماژە دەکات ١ رۆژ ١ هەفتە ١ مانگ ٤ مانگ بەکاتی کۆتایی یادهێنانەوەتان))

**یادگە لە کاتی یادهێنانەوە - سەبارەت بە تێستەکانی ژمارە ١ و ٢ .**



تێستی ژمارە ١ نیشانیدا تا ئەوکاتەی درککردنی بابەت جێگیربێت، کارایی یادگە لە کاتی پرۆسەی خوێندنەوەدا چۆنە.

لەم لیستە ستونییەدا کەسەکان ئەم ئەنجامانەی خوارەوە بەدەستدەهێنن، لە نێوان ٢ بۆ ٨ وشە لە سەرەتایی لیستەکەوە دێتەوە یاد، زۆربەی ئەو وشانەی کە دووبارە بوونەتەوە باشتر دێنەوە یاد، کە لە لیستەکەدا (ئەمە، و، لە) بوون. یەک تا دوو وشە لە پێنج وشەکەی کۆتایی زۆرجار لە یادگەماندا دەمێننەوە، ئەو وشەیەی کە لە هەموو وشەکانی تر جیاوازتر بوو (لیوناردۆ داڤینچی) بوو زۆرجار دێتەوە یادمان، وشەکانی ناوەڕاستی لیستەکە زۆر بە کەمی دێنەوە یادمان.

ئەوەی کە لە ئەنجامی ئەم تاقیکردنەوەیە ڕوونبوویەوە ئەوەیە کە یادگە و فێربوون بە پێشکەوتنی کات وەکو یەک بەرەوپێشەوە ناچن، تێدەگەن لە هەموو وشەکان بەڵام تەنها چەند دانەیەک لەوانە دێتەوە یادیان، جیاوازییەکانی نێوان شێوازی کارایی یادگە و درککردن یارمەتیمان دەدات ئەوە ڕوونبکەینەوە کە بۆچی زۆرێک

لە خەڵکی دوای تێپەڕینی چەند کاتژمێرێک لە کۆتایی فێربوون و تێگەیشتن هێشتا ناتوانن وشە و بابەتەکان بهێننەوە یاد. هۆکارەکەی ئەوەیە کە یادگە بە تێپەڕبوونی کات زۆر لاوازتر دەبێتەوە مەگەر ئەوەی کە هەلێکی باشتان هەبێت بۆ پشودان و جێگیرکردن.




هێڵکاری ژمارە ١٩ . بە تێپەڕبوونی کات، یادهێنانەوەی بابەتە فێربووەکان لاوازتر دەبێتەوە و مەگەر ئەوەی کە کاتی پێویست بۆ پشودان لەبەردەستدابێت.

کەواتە هێڵکاری داواکراو لە تێستی ژمارە ٢ زۆر ئاڵۆزترە لەو نموونە سادانەی کە خرانەڕوو. هەروەها بەئەگەرێکی زۆر ئەمە زۆر ئاڵۆزترە لەو هێڵکارییەی کە ئێوە بۆ نیشاندانی کارایی یادگەتان لە کاتی فێربووندا دەیخەنەڕوو. ناوەندی نمرەکانی تێستی ١ هاوشێوەی هێڵکاری ٢٠ نیشان دەدات.




ئاماژە دەکات بە کاتی دەستپێکی یادهێنانەوە

ئاماژە دەکات بە کاتی کۆتایی هاتنی یادهێنانەوە

هێڵکاری ژمارە ٢٠ . ئەم هێڵکارییە نیشانی دەدات زۆربەی ئەو بابەتانەی کە دەتوانین یادی بهێنینەوە پەیوەستە بە سەرەتا و کۆتایی پرۆسەی فێربوونەکە. کاتێک بابەتەکان زیاتر پەیوەندییان هەبێت بەیەکەوە باشتر دەتوانین یادیان بهێنینەوە. وەکو (A, B, C).

بە سەرنجدان بە هێڵکارییەکە ئەوە ڕووندەبێتەوە کە لە دۆخە ئاساییەکان و بە تێگەیشتنێکی جێگیر ئەم شێوە بابەتانە باشتر دێنینەوە یاد، لە دەستپێک و کۆتایی پرۆسەی فێربووندا، زۆربەی ئەو وشانەی کە دووبارەن، ئەو وشانەی کە یەک ڕیتمیان هەیە، ئەو وشانەی کە زۆر پێیان ئاشناییین زیاتر دێنەوە یادمان. زۆربەی ئەو وشانەی کە شاز و سەرنجڕاکێش و تاکن زیاتر دێتەوە یادمان، کە لە لایەن دەروونناس (ڤان ڕسترۆف)ەوە بۆیەکەمجار جەخت لەسەر ئەمە کرایەوە، وە هەروەها کەمترین وشە لە ناوەڕاستەوە بیرمان دەمێنێتەوە.

ئەگەر دەتانەوێت یادگەتان لە ئاستێکی باشدا جێگیربکەن، پێویستە ئەو خاڵە دەستنیشان بکەیت کە تێیدا یادگە و تێگەیشتن زۆرترین نزیکایەتیی و هەماهەنگییان بەیەکەوە هەیە، بۆ ئامانجە ئاساییەکان ئەم خاڵە لە خولێکی کاتیی دیاریکراوی ٢٠ بۆ ٥٠ خولەکیدا ڕوودەدەن، ئێوە لە نێوبەنددا پێویستان بە پشوە بۆئەوەی مێشک کاتێکی باشتر بەدەستبهێنێت بۆ تێگەیشتن و یادهێناوەی بابەتە جێگیرکراوەکان، بەردەوامیدان بە پرۆسەی فێربوون لە ماوەیەکی درێژدا دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی قەبارەی شتە فێربووەکان (بەهەمانشێوەی کە لە هێڵکاری ژمارە ١٩ دا هاتووە)




هێڵکاری ژمارە ٢١ . یادگە لە کاتی فێربووندا (لەگەڵ وە بەبێ بوونی پشوودان و وەستان) ماوەی فێربوون لە نێوان ٢٠ بۆ ٥٠ خولەک باشترین پەیوەندیی لە نێوان یادگە و تێگەیشتن دروست دەکات.

ئەگەر ماوەی فێربوون وتارێک، ڕاپۆرتێک، کتێبێک دوو کاتژمێر درێژە بکێشێت، باشتر وایە کاتێکی دیاریکراو لە نێوان ئەم دوو کاتژمێرەدا پشوو بدەن، ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی چەماوەی یادگە بە بەرزی بمێنێتەوە و دەتوانرێت ڕێگربێت لە کەمکردنەوەی تواناکان لە قۆناغی دواتری فێربووندا. دیاریکردنی کاتێکی تایبەت بۆ پشوودان دەتوانێت هەشتی خاڵی بەرزی فێربوون بە چوار وەستانی بچووک لە کاتی خوێندنەوەدا زامنبکات. هەریەک لەم وەستانانە کەمترن لە وەستانی سەرەکی کاتێک هیچ پشویەک لەکاتی خوێندنەوەدا بەخۆتان نادەن.

وەستان وەکو خاڵی پشوودان زۆر بەسوودە و دەبێتە هۆی ئەوەی بە شێوەیەکی زۆر ناوازە و کاریگەری ماندووبوونی جەستەیی و فیکریتان باشتر بکاتەوە و زاڵبن بەسەر خۆتاندا.




هێڵکاری ژمارە ٢٢ . یادگە دوای کۆتایی هاتنی ماوەی فێربوون – لێکدانەوەی خەڵکی، ئەم هێڵکارییە کە جۆرە جیاوازەکانی وەڵامەکانی خەڵکی نیشاندەدات، کاتێک کە داوایان لێدەکرێت ئەوە نیشانبدەن دوای کۆتایی هاتنی ماوەی فێربوونی شێوازی کارایی یادگەیان چۆنە. هێڵکارییەکەی خۆشتانی بۆ زیاد بکەن.

جیاواز لە هێڵکارییەکانی شێوەی ١٨، وەڵامەکانی تر ئەمانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت: ئەو هێڵە ڕاستەی کە یەکسەر دەگات بە خاڵی سفر، چەماوەکە بەرەو دابەزینێکی خێرا، ئەو هێڵەی کە تا نزیکەی ٥٥% دادەبەزێت، ئەوانی تر بە جێگیری دەمێننەوە، شێوە جیاوازەکانی ئەم چەماوەیانە، نیشاندەری بەرزی و نزمی نمرە جیاوازەکانە.

ڕاستییەکی سەرسوڕهێنەر ئەوەیە کە هیچ یەک لە نموونە و ئەو شتانەی کە پێشتر خرانەڕوو ڕاست نین، هەموو ئەوانە فاکتەرێکی زۆر گرنگییان بەهەند وەرنەگرت لە سەرەتاوە یادگە پاش کۆتایی هاتنی ماوەی فێربوون بەهێزە و دواتر دادەبەزێت و دەگۆڕێت بۆ چەماوەیەکی لارەوەبوو بەرەو نزمترین ئاست کە بە سەرەوخواربوونێکی خێرا بەرەو دابەزین دەڕوات و بەتێپەڕبوونی کات چەماوەکە تەواو دادەبەزێت.




هێڵکاری ژمارە ٢٣ . ئەم هێڵکارییە ئەوە نیشان دەدات کە چۆن مرۆڤ بۆ ماوەیەکی کەم دوای فێربوون یادگەی بەرزدەبێتەوە و پاشان بەخێرایی بەرەو دابەزین دەڕوات. (لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا ٨٠%ی شتە لاوەکییەکان بیردەچنەوە)

ڕۆژێک دەگەین بەو باوەڕەی کە بەرزبوونەوەیەکی کەم لە یادگەدا درووست دەبێت، هۆکاری ئەمەش ئاسانە چونکە کاتێک ماوەی فێربوون تەواو دەبێت، مێشکمان کاتی پێویستی پێتادێت کە زانیارییە نوێیەکان جێگیر و خەزنبکات، لەگەڵ یەک ڕێکیان بخات بەتایبەتی ئەو بابەتانەی کە لە کۆتایی ماوەکەدا فێربوون، چەند خولەکێکی پێدەچێت تا پەیوەندییەکی بتەو و بەهێز لەنێوان زانیارییەکاندا درووستبکات و کامڵ و تەواویان بکات، ڕێگە بدات هەموو زانیارییەکان درکبکرێن و مانا و واتایان پێبدات.

ئەو دابەزینەی کە دوای کەمێک بەرزبوونەوە ڕوویداوە زۆر خێرایە، دوای تێپەڕینی ٢٤ کاتژمێر لە ماوەیەکی فێربوونی خێرادا لانی کەم ٨٠% زانیارییە لاوەکییەکان فەرامۆشدەکرێن، نابێت ڕێگە بدەین دابەزینەکە بەم خێراییە ڕووبدات، دەتوانین بە ڕێگا و ستراتیجی و تەکنیکی سەرکەوتوو ڕێگری بکەن لەوەی کە مێشکمان دووچاری ئەم حاڵەتەبێت.

## تەکنیکەکانی یادگە - بەدواداچوون و تیۆریی

ئەگەر بەرنامەڕێژییەکی تەواومان بۆ پێداچوونەوەمان هەبێت دەتوانین ئەو هێڵکارییەی کە لە شێوەی ژمارە ٢٣ خراوەڕوو بگۆڕین و یادهێنانەوەی بابەتەکان لەهەمان خاڵی جێگیری سەرەوەدا بهێڵینەوە کە دوای ماوەی فێربوون وەرمانگرتوون. بۆ گەشتن بەم ئامانج و دەستکەوتە دەبێت مۆدێل و شێوازێکی پێداچوونەوەی بەرنامەبۆدارێژراو درووست بکەین، هەر پێداچونەوەیەک کە ڕێک لە دوای پرۆسەی فێربووندا ئەنجام

دەدرێت بەخێرایی بەمێشماندا دەڕوات، بۆ نموونە دەبێت یەکەمین پێداچوونەوە لە نزیکەی (١٠) خولەک دوای ماوەیەکی فێربوونی یەک کاتژمێری و بۆماوەی ٥ خولەک ئەنجامبدرێت. ئەمکارە دەبێتە هۆی ئەوەی کاتێک پێداچوونەوەی دووەم ئەنجام دەدەین یادگەمان بۆماوەی زیاتر لەیەک ڕۆژ بەبەرزی بمێنێتەوە و کاتێکی نزیکەی ٢ بۆ ٤ خولەکمان پێویست بێت. دوای ئەم ماوەیە ڕەنگە بۆماوەی نزیکەی یەک هەفتە بابەتەکە بە یادگە دەسپێردرێت و پێداچوونەوەیەکی دوو خولەکی دیکە دەتوانێت پرۆسەکە تەواو بکات و دوای یەک مانگ لە فێربوونی بابەتەکە درووست ببێت. دوای ئەم ماوەیە زانیارییەکان لە یادگەدا بۆ کاتێکی زۆر بەرز بە جێگیری دەمێنێتەوە. ئەمە بەو واتایە دێت کاتێک ژمارەی مۆبایلی تایبەتیی کەسێکی نزیکتان دەناسن و پێویست بە نوسینەوەی ناکات، هەمیشە هەرکات بتانەوێت لە یادگەتان ئەیهێننەوە.

یەکەمین پێداچوونەوە، بەتایبەتی ئەگەر بابەتەکەتان یاداشتکردبێت، دەبێت سەیرکردنەوەیەکی تەواوەتی لە یاداشتەکانتان هەبێت بۆ کۆپیکردن و نوێکردنەوەی دیدگاتان، دووەم و سێیەم و چوارەم و تا کۆتایی. پێداچوونەوەکان زیاتر وەکو ئەم وێنەیەی خوارەوەیەن، بەبێ گەڕانەوە بە یاداشتە کۆنەکان بتوانیت هەرشتێک کە دەتەوێت بیهێنیتەوە یاد و لەسەر کاغەز بینوسن. دەبێت ئەوە بەراورد بکرێت لەگەڵ یاداشتەکانی کۆتایی و هەموو زانیارییە زێدەبارەکان. ئەم یاداشتانانە یەکێکن لە گرنگترین لایەنەکانی پێداچوونەوەیەکی گونجاو کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر هەموو لایەنەکانی فێربوون، بیرکردنەوە و یادهێنانەوە هەیەتی. کەسێک کە پێداچوونەوە ناکات بەسەر

بابەتەکاندا بەردەوام هەوڵەکانی بەهەدەر دەدرێت و خۆی دەخاتە بارودۆخێکی نەگونجاوی خوێندنەوەوە.




هێڵکاری ژمارە ٢٤ . چۆن دەتوانین بابەتەکان بۆ ماوەیەکی درێژتر لە یادگەماندا جێگیربکەین.

هەرکاتێک دەگەینە بارودۆخێکی فێربوونی نوێدا، یادهێنانەوەی زانیارییەکانی پێشووتر بەرەو کەمبوونەوە دەچن، ئەو پەیوەندییەی کە دەبوو خۆبەخۆ درووست بووبایە لەناودەچوو، ئەمە بەو واتایە دێت کە درک و تێگەیشتنی ئەو لە بابەتە نوێیەکاندا بەو ئەندازەیەی کە دەبوو هەبێت، کامڵ و تەواو نییە و هەروەها کارایی و خێرایی لە تێگەیشتنی بابەتەکاندا کەمتر دەبێتەوە. ئەم پرۆسە نەرێنییە بەردەوام وەکو جوڵەی مارئاسا و پێچاوپێچ بەرەو خوارەوە دەڕوات و خەڵکی توشی بێزاری دەبێت بەهۆی لاوازی لە

تواناکانی بۆ پاراستنی زانیارییەکان، ئەو بابەتانەی کە بە تازەیی فێربووین فەرامۆشی دەکەین و هەرکاتێک کە بمانەوێت بابەتێکی نوێ فێرببین وا دەردەکەوێت کارێکی زۆر سەختمان لەبەردەمدایە. ئەنجامەکەی ئەوەیە کە زۆرێک لە خەڵکی دوای کۆتایهاتنی تاقیکردنەوە سەرتاسەرییەکان زۆر بە کەمی دووبارە پێداچوونەوە بە وانە و بابەتەکانیاندا دەکەنەوە و بەزۆری ئەو کتێب و تیانوسانەی کە وانەی تێدا دەخوێنن فڕێی دەدەن یان دەیسوتێنن.

شکست لە پێداچونەوە ئەوکاتە زیانی هەیە بۆ یادگەمان کاتێک ئێمە تەنها بە بەشێک لە زانیارییەکاندا بچینەوە و ئەوانی تر نادیدە بگرین، لە هەستی ناخوود ئاگایماندا نامێننەوە و ناتوانرێت سوودی لێوەربگرێت بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییە نوێیەکانی یادگەمان. چونکە یادگە پرۆسەیەکە کە لەسەر بنەمای پەیوەندیی و هاوڕایی دروست دەبێت، تا بابەتی کەمتر لە (عەمبارکردنی یادگە) بوونی هەبێت، ئەگەرێکی کەمتر بوونی هەیە کە بابەتە نوێیەکان تێیدا جێگیر و پەیوەست بکرێن.

لایەنێکی تر ئەوەیە سوودەکانی پێداچوونەوە زۆر زۆرە. هەرچی زیاتر چوارچێوەی کارایی زانینتان بپارێزن، زیاتر دەتوانن درکی بکەن و بەکاری بهێنن. لە کاتی خوێندنەوە قەبارەی بەفراوانی زانین کە لە بەردەستتاندا هەیە ئەو توانایە بە ئێوە دەدات کە زۆر ئاسانتر زانیارییە نوێیەکان درک بکەن و هەر بەشێکی نوێ لە زانیارییە درککراو و کۆنترۆڵکراوەکان لە ناوەندی عەمباری یادگەتاندا جێگیربکەن. ئەم پرۆسەیە زیاتر هاوشێوەی تۆپەڵە بەفری سەر شاخ وایە کاتێک بە خێراییەکی زیاتر دێتە خوارەوە و بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە زیاتر گەورەتر دەبێتەوە و لە کۆتاییدا بەئەندازەیەکی فراوان بەردەوام دەبێت لەسەر جوڵەی خۆیی. ئەم

باوەڕبەخۆبوونە، کار و گوزەرانی ئێوە باشتر و سەرکەوتووتر دەکاتەوە.

## سیستەمە تایبەتییەکانی یادگە و چۆنێتی بەهێز کردنی

لێرەدا لیستێک لە وشەکان لە کەناری چەند ژمارەیەکدا هاتوون، هاوشێوەی تێستی ژمارە یەک، هەر دانەیەکیان یەکجار بخوێننەوە، ئەو وشانەی کە دەیخوێننەوە بە کارتێک دابپۆشن، ئامانجی سەرەکی تێستەکە ئەوەیە یادتان بێتەوە کە چی ژمارەیەک لەگەڵ وشەکاندا هاتوون:

| | |
|---|---|
| ٤ گەڵا | ٥ فێرخوار |
| ٩ جلوبەرگ | ٨ پێنوس |
| ١ مێز | ٣ پشیلە |
| ٦ پرتەقاڵ | ٧ ئۆتۆمۆبێل |
| ١٠ چەقۆ | ٢ پەڕ |

ئێستا ئیتر تەماشای لیستەکە مەکەن و وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە.

## تێستی ژمارە ٤ : وەڵامەکان و سیستەمەکانی یادگە

لێرەدا ژمارەکان لە یەکەوە بۆ دە ژمارەن، بە یارمەتی یادگەتان لە تەنیشتی هەر ژمارەیەک ئەو وشەیەی کە لەسەرەوە لەگەڵیدا بوو بنوسن. ژمارەکان بەهەمان ڕێکخستنی سەرەوەدا نەهاتوون و بەڵکو پاش و پێش کراون، دوای ئەوەی ئەو وشانەی کە بیرتان

هاتەوە و نوسیتان لە تەنیشتی ژمارەکاندا، تەماشای لیستەکەی سەرەوە بکەن و نمرە ڕاست بەخۆتان بدەن.

| | |
|---|---|
| ٧ | ١ |
| ٤ | ٥ |
| ١٠ | ٨ |
| ٢ | ٩ |
| ٣ | ٦ |

نمرە: ________

**سیستەمەکان**

لە سەردەمی یۆنانی کۆنەوە تا ئێستا، خەڵکانێکی تایبەت بەهۆی کارە سەرنجڕێکێشەکانی یادگەیانەوە ئێمەیان خستوەتە ژێر کاریگەرییەوە. ئەوان دەیانتوانی سەدان بابەتی جیاواز لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی زۆر بەچاکی بهێننەوە یادی خۆیان، مێژوو و ژمارەکان، ڕووداو و ناوەکان، شوێنەکان، دەیانتوانی کارگەلێکی ناوازە بە یادگە و مێشکیان ئەنجامبدەن، ئەو کارانە لە نموونەی جێگیرکردن و پاراستنی تەواوی زانیارییەکانی بوارە زانستییەکان و یان بەیادهێنانەوەی هەموو ئەو زانیارییانەی کە ڕۆژانە کۆیدەکەنەوە.

لە زۆربەی کاتەکاندا ئەم کەسانە سوودیان لە پرەنسیپ و بنەمایەکی تایبەتی وەرگرتووە لە جێگیرکردنی بابەتەکاندا کە ئەویش پێی دەگوترێت بەهێزکردنی یادگە. ئەم بنەمایە بەشێوەیەکی نەریتی وەکو فێڵێکی پوخت هەژمار دەکرێن و جێگای قبوڵی واقع نەبوون و بەڵام لەم دوایانەدا تێڕوانین سەبارەت بەوان گۆڕانی بەسەردا هات. ئەوانە وەکو شێوەگەلێک دەناسێندرێن کە لە

سەرەتاوە مێشک والێدەکەن توانای ئەوەی هەبێت تا بابەتەکان بە ئاسانی و خێرایی فێرببێت و دواتر دوای ماوەیەکی زۆر درێژتر بە سوود وەرگرتن لە توانا سروشتییەکانی مێشک ئەوانە بهێنێتەوە یاد.

زانستی ئێستا سەبارەت بە شێوازی کارایی مێشک نیشانی دەدات ئەم بنەمایە لە ڕاستیدا زۆر پەیوەستە بە ڕێسا بنەڕەتییەکانی مێشکەوە. ئاکامی سوود وەرگرتن لە بنەڕەتی بەهێزکردنی یادگە زۆربوونی متمانە و ناوبانگی ئەو بووە و ئەوان لە ئێستادا وەکو ئامرازێکی یارمەتیدەر زیاتر لە پرۆسەی گشتی فێربوون لە زانکۆ و خوێندنگایەکاندا فێردەکرێن. بەهێزکردن و چالاکی کارایی یادگە دەتوانێت بەتەواوەتی بەرچاو بێت و جۆراوجۆری تەکنیکەکاو زۆر زۆرن.

لە ڕاستیدا لە دەستپێکی دەیەی ۱۹۹۰ دا دامەزراوەی (میمۆریاد) پێشپڕکێی جیهانیی بۆ یادگە، دامەزرا. لە ئەنجامی دامەزرادنی ئەم دامەزراوەیە، سنوورەکانی دەروونناسی کلاسیک لەناو چوون، مەوداکانی تواناکانی مێشک پەرەیان سەند و ڕیکۆردگەلێکی ناوازەی نوێیان هێنایە بوون. (دۆمینیک ئۆبراون) لە یەکەمین پێشبڕکێی جیهانی یادگەدا نەک تەنها هەموو کارتەکانی لە ٤٢/٦ چرکەدا لەبەرکرد بەڵکو لە ٥٧ چرکەدا، ۱۰۰ ژمارەی دوانی لەگەڵ ئەوانەدا هێنایە مێشکدا! بۆ دەستپێکردن دەبێت لە چەند لاپەڕەی ئاییندەدا ئەو بیرۆکە سەرەکییەکەی کە لە پشتی ئەم سیتەمەوە هەیە بناسێنین و سیستەمێکی سادە بۆ پاراستنی زیاتری دە بابەتەکە بخەینەڕوو. وا گریمانە بکەن ئەوەی کە دەبێت بیهێننەوە یادتان ئەو وشانەی خوارەوەیە:

١ مێز      ٦ پرتەقاڵ

٢ پەڕ      ٧ ئۆتۆمۆبێل

٣ پشیلە      ٨ پێنوس

٤ گەڵا      ٩ جلوبەرگ

٥ فێرخواز      ١٠ چەقۆ

بۆ یادهێنانەوەی ئەم وشانە، بەکاربردنی سیستەمێک کە سوودی بۆ وزەی پەیوەندیی و کۆکردنەوەی زانیارییەکانی هەبێت پێویستە، بۆئەوەی بتوانن وشەکان پەیوەست بکەن بە ژمارە ڕاستەکەوە. باشترین سیستەم بۆ ئەم جۆرە بوارانە سیستەمی ژمارەی ڕیزکراوە کە تێیدا هەر ژمارەیەک وشەیەکی پەیوەستی بەخۆیەوە هەیە.

١ یار (bun)

٢ چوو (shoe)

٣ سێو (tree)

٤ بەهار (door)

٥ گەنج (hive)

٦ کەش (sticks)

٧ کەوت (heaven)

٨ تەشت (skate)

٩ دۆ (vine)

١٠ دێ (hen)

بە مەبەستی پاراستنی یەکەمین لیستی وشەکان پێویستە ئەوانە بە ڕێسایەکیگونجاو پەیوەست بکەین بە وشە ڕێکخراو و ڕیتم

دارەکانەوە کە ڕێکی ژمارەکان بن لە خوێندنەوەدا، ئەگەر ئەم کارە بە سەرکەوتووی ئەنجامدرا، وەڵامی ئەو پرسیارەی کە دەڵێت: چی وشەیەک لەگەڵ ٥ (فایڤ) دا ڕێکە بە شێوەیەکی ناخوود ئاگایی وشەی گەنج (هایڤ) دێتە مێشکماندا و لەگەڵیدا شێوەی ڕێکخراو و هاوڕیتمی وشەکە یادماندێتەوە. (تەماشای یەکەمین وێنەی ڕەنگدار بکەن، هەڵبەت ئەم وێنەیە بۆ وشە ئینگلیزییەکانە لەگەڵ ژمارە ئینگلیزییەکان)

## توانایی بێوێنەی یادگە

خاڵێکی گرنگ لەم ڕێسایە و هەموو یستەمەکانی تری یادگە ئەوەیە کە باوەڕمان بەخۆمان هەبێت وشەی ڕێکخراو و ڕیتمدار و ئەو وشەیەی کە دەبێت جێگیر و حەفزبکرێت بەتەواوەتی و بەشێوەیەکی بتەو بەیەکەوە پەیوەست بکرێن. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە دەبێت شێوە پەیوەستەکان بەیەکەوە یەکێک یان زۆرێک لەم بوارانەی خوارەوەی تێدا بێت، یەکەمین پیتێک کە لێیەوە دەستەواژەکان درووستدەکرێن کە بە ئاسانی بتوانرێت بپارێزێت و جێگیربکرێت. (توانایی بێوێنەی یادگە)

## یەکەم: **بەهێزکردنی هەستەوەرەکانمان**

مەبەست لێی ڕێکخستنی هزر و ئاگاییە، ئەو کەسانەی کە باشترین یادگەی سروشتییان هەیە و لە گەورەترین زمانی یادەوەریی بەهرە وەردەگرن، هەستەوەرە ئیستسنائییەکانییان لە ئاگاییان پەرەپێداوە و دواتر ئەم ئاگاییەیان بەیەکەوە ڕێکخستووە بۆ ئەوەی سوود لە یادگەیان وەربگرن. لە گەشەسەندنی یادگەیاندا گەشتوون بەم ئەنجامەی کە پێویستە ئاگایی لە خۆیاندا بە شێوەیی

گەشەکردنی هەستەکی و بەشێوەیەکی ڕێکخراو پەروەردەبکرێن و ڕاهێنانیان بۆ بکرێت.

هەستەوەرەکان

١) بینین
٢) بیستن
٣) بۆنکردنی
٤) تامکردن
٥) بەرکەوتن
٦) هەستی جوڵە لە ماسولکەکان (ئاگایی و گونجاندن لە جوڵەی جەستە)

دووەم: **جوڵە**

لە هەر شێوەیەکی بەهێزکردنی یادگەدا جوڵە و بزاوتن پانتاییەکی فراوان لە شیمانە بۆ مێشکمان فەراهەمدەکات، بۆئەوەی پەیوەندییان لەگەڵ درووستبکات و لەکۆتاییدا بابەتەکان بهێنێتەوە یاد، کاتێک وێنەکان دەجوڵێن بیانکەن بە سێ ڕەهەند (بوعد)ەوە.

سێیەم: **نزیکایەتی**

ئەو شتەی کە دەتانەوێت لەبەری بکەن و لە یادتاندا بمێنێتەوە لەگەڵ شتێکی تردا نزیکایەتی بۆ درووستبکەن، ئەم بابەتە بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی و ناوی کەسەکان و شوێنەکان زۆر گرنگە تۆ دەتوانیت ئەو دەستەواژەیەی کە ئاڵۆز و تازەیە بە مێشکتان لەگەڵ دەستەواژەیەکی تر نزیکی بکەنەوە بۆئەوەی بیرتان نەچێتەوە. نموونە: لیوناردۆ داڤینچی = قاچاغچی

چوارەم: **چێژ**

هەموومان یادگەیەکی کامڵ و تەواومان لەم ڕەهەندە هەیە، کەواتە لە کاتی لەبەرکردندا سوود لە چێژ وەرگرن.

پێنجەم: **گاڵتە و گەپ**

لەگەڵ یادگەتاندا خۆش بگوزەرێنن، تا زیاتر بابەتەکە خۆش و سەرنجڕاکێش و پێکەنیناوی و نامۆ بێت بەشێوەیەکی زۆر باشتر لە یادگەتاندا دەمێنێتەوە، (سالڤادۆر دالی) وێنەکێشێکی سوریالیستی بوو، دەیگووت: ((وێنەکانی من ئەو وێنانەن کە لەلایەن کەسێکی نائاساییەوە کێشراون، زۆربەی کاتەکان ئەو وێنانە یادگارییەکانی شەو و خەیاڵەکانی ڕۆی تێدا کێشراوە))

شەشەم: **خەیاڵ**

ئەنیشتاین گووتی: ((خەیاڵ لە زانست گرنگترە، چونکە زانست سنووردارە و لە کاتێکدا خەیاڵ تەواوی دونیای لە ژێر دەستدایە، دەبێتە هۆی پەرەسەندنی پرۆسەیەک و لە دایک بوونەوەیەکی دووبارە بە تیۆریا دەدات))، هەرچی زیاتر سوود لە خەیاڵتان وەربگرن یادگەتان بەهێزتر دەبێت.

حەوتەم: **ژمارە**

ژمارە پێدان بە شێوەیەکی ڕێکخراو، کارایی و کاریگەرییەکی زیاتر دەخاتەسەر یادگە.

هەشتەم: **هێما و نیشانەدانان**

مانا بەخشین بە بابەت و بوارە بێمانا و سادەکان، ئەگەری یادهێنانەوە بیرنەچوونەوەی بابەتەکان زیاتر دەکات. ئێمە پێویستە لەکاتی خوێندنەوەدا مانا و واتا بۆ چەمک و بابەتەکان بدۆزینەوە و هێما و ڕەمزی تایبەتییان بۆ دابنێین.

نۆهەم: **ڕەنگ**

هەرکاتێک کە گونجاوە و لە هەر شوێنێکدا کە دەشێت سوود لە ڕەنگەکان ببینن، بۆئەوەی بیرۆکەکانتان ڕەنگاوڕەنگتر و قەشەنگتر بێت، بەم کارەتان زیاتر لە یادگەتاندا دەیهێڵنەوە.

دەهەم: **ڕێکخستن و پلەبەپلەیی**

لەگەڵ بنەماکانی تردا، ڕێکخستن و ڕیزکردن و سیستماتیکی دەتوانێت یارمەتی مێشکتان بدات بۆ یاد هێنانەوە، سوود وەرگرتنێکی فراوان لە ڕێکخستن و بەیەکدواهاتن ئەو ئەگەرە بۆ ئێوە درووست دەکات چوارچێوەکانی یادگەتان بەرزتر بکەنەوە. بۆ نموونە ماتریس (چوارچێوەی بیرکاری و لۆژیکی مێشکتان) لە پەرەسەندنی یادگەدا دەتوانێت زیاد لە ١٠ هەزار بابەت جێگیر و پارێزراو بکات لە مێشکدا.

یازدەیەم: **وێنەی ئەرێنی**

یازدەهەم: **وێنە ئەرێنییەکان**

زۆربەی کاتەکان وێنە خۆش و ئەرێنییەکان باشتر دێنەوە یادمان، چونکە ئەوان ئەم توانایە لە مێشکدا درووست دەکەن کە

بتانەوێت بە وێنەکەدا بچنەوە. وێنەی تایبەتی نەرێنی و ناپەسەند تەنانەت ئەگەر زۆربەی بنەماکانی سەرەوەی تێدا بێت و یارمەتی لەو بنەمایانەی سەرەوە وەربگرین بۆ یادهێنانەوەی هێشتا مێشکمان ڕێگری لێدەکات، چونکە گەڕانەوە بۆ ئەو وێنانە بە کارێکی ناپەسەندی دەزانێت و زوو دەیەوێت لەبیری بکات.

دوازە دەهەم : **قوڵبونەوە و نوقمبوون**

لە هەموو وێنەکاندا لە ئەندازە و شێوە و دەنگ و ڕەنگیدا زیادەڕەووی بکەن، ببیەنە قوڵای مێشکتانەوە و نوقم و نغرۆی بکەن، بۆئەوەی بەباشترین شێوە بچەسپێت و دواتر چاکتر بێتەوە یادتان.

## سیستەمی یادگە ( ژمارە - ڕێکخستن)

کاتێک کە وێنەکان درووستدەکەن، ئەوە گرنگە کە وێنەیەکی عەقڵی زۆر ڕون لە پێشی چاوەکانتاندا هەبێت. بۆ گەیشتن بەم شێوەیە، بە زۆری باشترین کار ئەوەیە کە چاوەکانتان دابخەن و وێنەکە بخەنە مێشکتانە، بە یەکێک لەو ١٢ ڕێسایەی سەرەوە بەتایبەت هەستەوەرەکان هەوڵ بدەن هەستی پێبکەن و بیهێننەوە یاد. بۆ نموونە سەبارەت بەو خواردنەی کە دوێنێ خواردتان، بیربکەنەوە، چاوەکانتان بدابخەن، سەرنجبدەن چۆن مێشکتان دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ دوێنێ و هەوڵدەدات بیهێنێتەوە یاد و دەیەوێت وێنەی خواردنەکە درووست بکات.

بۆئەوەی بابەتەکە زیاتر ڕوونببێتەوە ڕێگە بدەن ژمارە ١ بۆ ١٠ لەگەڵ وشەکانیان تێست بکەین کە هەمان وەزن و قافییە و ڕیتمیان هەیە. (تێبینی ئێمە لێرەدا وشە و ژمارەکانمان بە ئینگلیزی هێناوە لەبەرئەوەی لانەدەین لە ئەمانەتی وەرگێڕانی کتێبەکە و هەروەها بۆئەوەی بگونجێت لەگەڵ ئەو وێنەیەی کە نوسەر لە کۆتاییدا دایناوە، بەڵام ئێوە دەتوانن بۆ زمانی کوردی یان هەر زمانێکی تر سوود لەم ڕێسا و سیستەمە وەربگرن)

**وەن (bun) سەمون مێز (یەک – یار)**
خەیاڵی سەمونێکی گەورە بکەن (bun) کە لەسەر مێزێک دانراوە و دەکەوێتە خوارەوە لەسەر مێزەکە، بۆن و تامێکی خۆشی بۆ درووست بکەن.

**توو (shoe) پێڵاو پەڕ (دوو – چوو)**
خەیاڵی پێڵاو (shoe) ێکی قەشەنگ بکەن کە لە لایەن خۆشەویستەکەتانەوە بە دیاری بۆتان کڕدراوە و زۆر حەزتان لێیەتی. بەڵام پەڕێکی تێدایە نایەڵێت بیکەنە پێتانەوە و پێتان ئازار دەدات.

**تری (tree) دار پشیلە (سێ – سێو)**
خەیاڵی درەخت (tree) ێکی گەورە بکەن، پشیلەیەکی هاروهاج ڕۆشتوەتە سەری و ئەمبەر و ئەوبەر دەکات.

**فۆر (door) دەرگا گەڵا (چوار – بەهار)**

خەیاڵ بکەن دەرگا (door)ی ژوورەکەتان لەکاتی کردنەوە و داخستنیدا بەر گەڵای درەختی ماڵەتان دەکەویت و خشەخش دەکات.

**فایڤ (hive) شانەی هەنگ فێرخواز (پێنج – گەنج)**

خەیاڵی فێرخوازێک بکەن کە لەسەر مێزەکەی دانیشتووە و بە جلێکی تایبەت خۆی داپۆشیوە و شانە هەنگەکە (hive) بەدەستییەوەیە و دەتکێتە سەر زەوییەکە.

**سکس (sticks) دار پرتەقاڵ (شەش – کەش)**

پرتەقاڵێکی گەورە وێنا بکەن ئەوەندەی مێزەلانێکی منداڵان گەورەیە و بە دار (sticks) ێک چەند جارێک پێیاندا کێشاوە و ئاوی پرتەقاڵەکەی لێدێتە خوارەوە، تامێکی خۆشی هەیە.

**سێڤن (heaven) ئاسمان ئۆتۆمۆبێل (حەوت – کەوت)**

خەیاڵ بکەن فریشتەکان لەبری ئەوەی کە لە ئاسمان (heaven) دابن لەسەر ئۆتۆمبیلەکەتان دانیشتوون خۆتان وێنا بکەن خەریکی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلن لە ئاسماندا.

**ئەیت (skate) ئسکێت پێنوس (هەشت – تەشت)**

خەیاڵ بکەن خەریکن یاری خلسکێنە (skate) دەکەن و گوێتان لە دەنگی تایەرەکانی سکێتە دەبێت کە هەندێک پێنوسی

ڕەنگاوڕەنگتان پێوە کردووە و وێنەیەکی زۆر جوانی پێ دەبەخشێت.

**ناین (vine) دارمێو جل (نۆ – دۆ)**

دار ترێیەک (vine) بهێننە خەیاڵی خۆتان کە چەندین جلی پێوە هەڵواسراوە و لەگەڵ ئاراستەی بابەکەدا ئەوانیش بەملاولادا دێن و دەچن.

**تێن (hen) مریشک یاری شەترەنج (دە - دێ)**

**هەر خۆشیتان!**

ئێستا لە لاپەڕەی دواتر هەموو ئەو وشانەی کە دێتەوە یادتان بینوسن، بە کەمێک هەوڵدان ڕەنگە بۆ چەند جارێک بتوانین هەموو (١٠) وشەکە بهێنینەوە یادی خۆمان تەنانەت ئەگەر سوود لە سیستەمێکی یەکسانیش وەرگرین، ئەو وشانەی کە دەمانەوێت بەیادی بهێنینەوە دەتوانرێت هەر وەکو جل لە قولاب دەربهێنین و جلی دیکە بخەینە شێنی. ئەو وشانەی کە دەبێتە هەمیشە لە مێشکدا بمێننەوە و ئەوانەی کە ئەستەمە لە یادی بکەین، ئەو وشە قافییەدار و بە ڕیتمانەن.

بەهەمانشێوە کە پێشتریش ئاماژەمان بۆیان کرد ڕێسا و یاسا و سیستەمی زۆری تریش هەن کە بەهەمان ئەندازە ئاسان دەتوانرێت بیهێنینە مێشکمانەوە، بەڵام لەم کتێبەیەدا تەنها ئاماژەمان بەم سیستەمە کردووە (لە کوردیدا پێشتر بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی

سوود له قافییه‌ی شیعری وه‌رده‌گیرا بۆئه‌وه‌ی خوێنه‌ر به باشی له‌بیری بمێنێته‌وه واتا وشه عه‌ره‌بی و کوردییه هاوواتاکان ده‌کران به دێڕێکی شیعری سه‌ربه‌خۆ).

ئه‌و سیسته‌مانه‌ی که زۆر سوود به‌خشن سیسته‌مه بنه‌ڕه‌تییه‌کانن که یارمه‌تی یادگه‌مان ده‌دات زیاد له هه‌زاران بابه‌ت به سیسته‌می ژماره - قافییه له مێشکماندا جێگیر و حه‌فز بکه‌ین. کلیلێکمان پێده‌دات بۆئه‌وه‌ی ژماره و کات (به‌روار) بهێنینه‌وه یادی خۆمان. هه‌ندێک کات ناتوانین ناو و شێوه‌ی ئه‌و که‌سانه بهێنینه‌وه یادمان که بینیومانن یان چاوپێکه‌وتنمان له‌گه‌ڵیان ئه‌نجام داون، بۆئه‌مه سیسته‌می شێوه - ناو یارمه‌تیمان ده‌دات بۆ ناسینه‌وه‌یان، بۆئه‌وه‌ی ئه‌م خووه ناخۆش و به‌رده‌وامه وازلێبهێنین.

لەمەی خوارەوەدا وشەی کلیلی قافییەدار بۆ سیستەمی ژمارە - قافییە کە پێشتر پێتاندرا بنوسن، لە تەنیشتییەوە ئەو وشانە بنوسن کە لە ڕووی قافییە و وەزنەوە لێیەوە نزیکن.

| وشە قافییەدارەکان | وشە پەیوەستەکان |
| --- | --- |
| ١ ______ | ______ |
| ٢ ______ | ______ |
| ٣ ______ | ______ |
| ٤ ______ | ______ |
| ٥ ______ | ______ |
| ٦ ______ | ______ |
| ٧ ______ | ______ |
| ٨ ______ | ______ |
| ٩ ______ | ______ |
| ١٠ ______ | ______ |

**ئەرکێکی ئەستەم**

بەهەمانشێوەی کە دروستکردنی پەیوەندی و لێکدانەوە لەم بەشەیەدا فێربوون، یادگە لە سەرەتاوە پرۆسەیەکی هاوڕێ و ئاوێتە یان پەیوەستە، کە بەشێکی فراوانی وابەستەیە بە وشەی کلیلی (بنەڕەتی) و مانای کلیلییەوە کە بەشێوەیەکی گونجاو دروستکراون و شێوەیان نەخشێندراوە. ئەم تەکنیکانەی

بەهێزکردنی یادگە لە ڕاستیدا زۆر گرنگ و کاریگەرن هەندێک کات ئەوەندە بەسەرکەوتووی کارەکان ئەنجام دەدەن کە باوەڕبەخۆمان ناکەین. مامۆستایەک ئەم سیستەمەی لە وانەیەکدا بەسەر فێرخوازە ١٤ ساڵانەکانیدا لە سووید پیادەکرد، پێیانی گووت دەبێت تەواوی هەوڵتان بخەنەگەڕ تا ئەوەندەی لە تواناتاندا هەیە ناوی تەواوی هەموو پایتەختەکانی وڵاتان حەفز و لەبەربکەن.

یەکێک لە فێرخوازەکان کوڕێکی هەرزەکار بوو کە بە بێتاقەتی و نائومێدییەوە هاتەوە بۆ ماڵەوە و بە باوکی گووت ئەمە ئەرکێکی قورس و ئەستەم و نادادپەروەرانەیە کە مامۆستایەکەیان پێی ڕاسپاردوون، باوکی کوڕەکە کە لە خولی بەهێزکردنی توانا عەقڵی و هزرییەکاندا بەشداری کردبوو، فێری کوڕەکەی کرد چۆن سوود لە تەکنیکەکانی یادگەی وەرگرێت، زۆر بە ئاسانی بەسەریدا زاڵ ببێت.

دوو هەفتە دواتر بەڕێوبەری قوتابخانە پەیوەندیی بە باوکی کوڕەکەوە کرد و داوی پۆزشی کرد کە پێویستە هەواڵێکی ناخۆش لەبارەی کوڕەکەیەوە بدات، ئەویش ئەوە بوو کە کوڕەکەی لە تاقیکردنەوەکان قۆپییەی کردووە، کاتێک باوکی کوڕەکە داوای ڕونکردنەوەی زیاتری کرد، پێی گوترا کە لە تاقیکردنەوەی جوگرافی بەرزترین نمرەی هەموو قوتابییەکان ١٢٣ بووە، لە کاتێکدا کوڕەکەی ئێوە نمرەی تەواوی بەدەست هێناوە و ٣٠٠ ی لە ٣٠٠ هێناوە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە کوڕەکەتان قۆپییەی کردووە.

دوای ئەوە کێشەکە چارەسەر بوو، کۆتایی چیرۆکەکە زۆر بەچێژبوو، داوا لە کوڕەکە کرا سیمیناری تایبەت بۆ هاوپۆلەکانی

بکات و فێرییان بکات چۆن دەتوانن سوود لە یادگەیان وەربگرن و بەکاری بهێنن.

## بۆ پێشەوە

ئەگەرچی بەشی یادگە تەواو بوو، بەڵام سێ بەشی ئایینده کە سەبارەت بە وێنە عەقڵییەکانە، بە تەواوەتی پەیوەستە بە یادهێنانەوە و یادگەوە، دەبێت دووبارە پێداچوونەوە بەم زانیارییانەی بەشەدا بکرێتەوە بۆ بابەتەکانی دواتریش.

## بەشی شەشەم

# وێنە عەقڵییەکان - دەروازەیەك بۆ سروشتی وشە و بیر

پێداچونەوە
- ڕاهێنان و گەڕان
- وشە کلیلییەکان - یادگە و داهێنان
- ماهییەتی چەندلایەنەی وشەکان
- وشەی کلیلی - وێنە عەقڵییەکان لە بەرامبەر یاداشتە ستاندارد‌ەکان

لەم بەشەیەدا ئاشنای وێنە عەقڵییەکان دەبن، سیستەمێک کە شێوازی سوود وەرگرتن لە زمان، وشەکان، شێوەپێدان بۆ بەیادهێنانەوە، هەروەها شێوازی بیرکردنەوەی داهێنەرانە و چارەسەری گرفتەکان پەرەپێدەدات.

**ڕاهێنان و گەڕان**

وا خەیاڵ بکەن ئێوە بەبەردەوامی کاتی خۆتان تەرخان دەکەن بۆ خوێندنەوەی چیرۆکە کورتەکان، لانی کەم ڕۆژی پێنج چیرۆکی کورت دەخوێننەوە و زۆرجار یاداشتییان دەکەن بۆئەوەی هیچ یەکێک لە چیرۆکەکانتان بیرنەچێتەوە. هەروەها وابزانن بۆ خۆ دڵنییاکردنەوەتان لەوەی کە لایەنە لاوەکییەکانی چیرۆکەکەش بێتەوە یادتان سوودتان لە سیستەمی بە فایلکردنی کارتەکان وەرگرتووە. بۆ هەر چیرۆکێک کارتێک بۆ ناونیشان و نوسەر، کارتێکی تر بۆ هەر پەرەگرافێک بهێننە پێشچاوی خۆتان. لەسەر هەر یەکێک لەوانە وشە یان دەستەواژەی سەرەکی یان ئەوانەی کە بە پلەی دووەم گرنگییان هەیە بینوسن. وشە و دەستەواژە کلیلییەکان (سەرەکییەکان) دەتوانرێت یان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە چیرۆکەکەوە دەربهێندرێن یان وشەکانی ئێوە بن، چونکە ئەوکات زۆربەچاکی کورتەی چیرۆکەکە دەخەنەڕوو.

ئێستا خەیاڵ بکەن یەکێک لەو چیرۆکانە، چیرۆکی کیوسا و هیباری بەرهەمی ئەدەبی (لافکادیۆ هێرن)ە، ئێوە کارتی تایبەتتان سەبارەت بە ناونیشانی چیرۆکەکە و چیرۆک نوسەکەتان ئامادەکردووە.

ئێستا چیرۆکەکەی خوارەوە بخوێننەوە بۆ ڕاهێنان، وشە و دەستەواژەی بیرهێنەرەوەی سەرەکی لە بیرۆکەی سەرەکی و لاوەکی پەرەگرافی یەکەم لەو بۆشاییەی کە لە لاپەڕەکانی دواتردا بۆمان جێهێشتوون پڕبکەنەوە.

کیوسا – هیباری

١ – قەفەزەکەی ئەو نزیکەی دوو ئینجی ژاپۆنی بەرز و یەک ئینج و نیم درێژە: دەرگایەکی بچووکی تەختەیی لە ناوەندێکدا دەسورێت کە بە زەحمەت نوکی پەنجە بچوکەکەی من تێیدا جێیدەبێتەوە، بەڵام ئەو بۆشاییەکی زۆری لەو قەفەزەدا هەیە، مەودایەک بۆ ڕۆشتن، بازدان و باڵگرتنەوە چونکە ئەو ئەوەندە بچوکە کە ئێوە دەبێت زۆر بە وردی تەماشای دەوروبەری تۆڕە قاوەیی ڕەنگییەکەی بکەن بۆئەوەی بتوانن بیبینن. من هەمیشە دەبوو چەندین جار و ئەویش بە ڕوناکیەکی پێویستەوە بە دەوری قەفەزەکەدا بخولامایەتەوە ئینجا بزانم لە کوێیە و دواتر ئەوم لە کاتی پشودان لە گۆشەیەکی سەرەوەی قەفەزەکەدا یان لە کاتی بەرز و نزمبوونەوە و ئەولاولاکردندا دەبینی.

٢ – جرجرەیەک (گیانلەبەرێکی زۆر بچوکە وەکو کولەیە بەڵام لەو بچوکترە جیرەجیرە دەکات) بهێننەپێش چاوی خۆتان کە ئەوەندەی مێشێکی ئاساییە، جوتێک شاخی پێوەیە زۆر بەرزترە لە جەستەی و ئەوەندە ڕون و ئاشکران تەنانەت کاتێک ڕوناکییەکی پێویستیش نییە دەتوانن بەباشی بیبینن. کیوسا و هیباری (چەکاوەک و چمەن) ناوە ژاپۆنییەکەی ئەون، نرخی نزیکەی ١٢ سەنت دەبێت، دەتوانین بڵێین کە ئەم نرخە لە نرخی هەمان کێشی ئاڵتون بەرزترە، ١٢ سەنت بۆ شتێک کە وەکو مێشێک وایە.

٣ – ڕۆژانە دەخەوێت و دەچێتە قوڵایی بیرکردنەوەوە جگە لەوکاتانە نەبێت کە سەرگەرمی پارچە باینجانێک یان جەیارێکی ترە کە هەموو ڕۆژێک دەکرێتە ناو قەفەزەکەیەوە. پاککردنەوە و خۆراکپێدان تا ئاستێکی زۆر گرفت و ناڕەحەتە، ئەگەر بتانتوانیبایە بیبینن بە خۆتان دەگووت ئەمە زۆر پێکەنیناوی و گاڵتەجارییە کە

لەبەر بونەوەرێکی ئەوەندە بچوک ئەو هەموو دەردەسەری و سەرئێشەیە قبوڵ بکەن.

٤ — بەڵام هەمیشە لەگەڵ خۆرئاوابووندا، ڕۆحە ناکۆتا بچوکەکەی ئەو بێدار دەبویەوە: دواتر ژورەکە کەم کەم پڕدەبوو لە ئاوازێکی دڵڕفێن و ڕۆحانی کە شیرینییەکی بێ ئەندازەی هەبوو. هەروەکو دەنگی ئاڵی چریکە و شەپۆلی نەرم و ناسک. بە تاریکتربوونی هەوا دەنگەکەی دلگیرتر دەبوو، هەندێک کات ئەوەندە دەنگی بەرزدەکردەوە کە هەمووماڵەکەی بە زرنگانەوەیەکی بەرز دەلەراندەوە و هەندێک کاتیش ئەوەندە دەنگەکەی هێواش بوو کە زرنگانەوەکەی کەمترین دەنگی هەبوو.

چی ئەوکاتانەی کە دەنگی بەرز بوو یان نزم تایبەتمەندییەکی ڕەوانی دەپاراست کە سەرسوڕهێنەر بوو. بە درێژای شەو ئەو بونەوەرە بچوکە ئاوازی دەخوێند، تەنها ئەو کاتانە دەوەستا کە دەنگی پەرستگایەکە ڕۆژهەڵاتنی نیشاندەدا.

٥ — ئێستا ئەم دەنگە لاوازە دەنگی عیشقە، عیشقێکی ناڕون کە نابینرێت و نەناسراوە. هیچ کەسێک لە تایبەتمەندی ئامادیی وەها بونەوەیێک ئاگادارنییە و ئەو نەناسراوە، تەنانەت بنەماڵەکەیان لە نەوەکانی ڕابردووش لە ژیانی شەوانەی کێڵگەکان و لە بەهای بێوێنەی شیعر بێئاگان.

٦ — ئەوانە لە هێلکەیەکەوە هاتونەتە دەرەوە کە لە گۆزەیەکی گڵێنەکراو و دوکانی فرۆشیارێکی مێرووەکاندا بوون، داتر هەموو تەمەنییان لە قەفەزێکدا بەسەر دەبەن، بەڵام ئەو شیعر و ئاواز بەشێوەیەک دەخوێنێت کە سەدان ساڵە دەخوێندرێتەوە، ئەوەندە بێوێنە بوو کە بە ئاسانی دەمانتوانی بایەخی هەمو نۆت و دەربڕینێک درک بکەین، هەڵبەت ئەو ئەم شتانە فێرنەکرابوو، کاتێک

که ڕۆحی ئەو لە درێژایی شەودا لە چیمەنەکانەوە هاوار دەکات، ئاوازەکەی لە یادگەیەکی ڕێکخراو و قوڵ و ناکۆتا بەشێوەیەک دەخوێنێت تامی ژیان خۆشتردەکات. دواتر ئەو ئاوازە هەوڵی عیشق و مردنی بۆ دەهێنێت، ئەو هەموو شتێک لەبارەی مردنەوە فەرامۆش دەکات، تەنها عیشق دێنێتە یاد و بۆ بوکێک ئاواز دەخوێنێت کە هەرگیز نایات.

٧ – کەواتە ئارەزووی ئەو بەشێوەیەکی ناخوودئاگا پەیوەستە بە ڕابردووەوە، ئەو لە بێدەنگیدا دەگری و بانگی خواوەندەکان دەکات بۆئەوەی بیگەڕێننەوە بۆ ڕابردوو، مرۆڤە عاشقەکانیش بێ ئاگایانە هەمان ڕەفتار ئەنجامدەدەن.

ئەوان خەیاڵە پوچەکان وەکو ئایدیاڵ دەبینن و لە لایەکەوە ئایدیاڵەکەی ئەوان سێبەرێکی ڕووتە لە ئەزموونێک کە لەو شێوەوە وەریانگرتووە، وەهمێک یادگەیەکی ڕێکخراو، بونەوەرەکانی ئەم جیهانە هیچیان لەوان ناچن، ڕەنگە تەنانەت توخمی درووستکەری ئەو ئایدیاڵە بن، یان تەنانەت نیشانەگەلێک لەو شتە ئایدیاڵە، بەڵام بەهەرحاڵ، داخوازی ئەو بونەوەرە بچوکە شتێکە کە شەکوا و گلەیی لەودا بێ کاریگەرە.

٨ – ئەمانە هەڵەی من نییە، منیان ئاگادار کردەوە کە ئەگەر ئەم بونەوەرە بێزار بکرێت ئیتر ئاواز ناخوێنێت و زۆر زوو دەمرێت، بەڵام شەوانێکی درێژ ئەم چریکە خەمئەنگیز و شیرین و بێ وەڵامانەی مایەی شەرمەزاریی منن و سەرەنجام ئەم بابەتە بۆ من مایەی بێزاری و ڕەنج و عەزابی ویژدان بوو و هەوڵمدا بونەوەرێکی تری مێینەی بۆ بکڕم، لەم وەرزەدا پەیداکردنی شتێکی وا زۆر سەخت بوو. ئیتر کیوسا و هیبارییەکی مێینە و نێرینە بۆ فرۆشتن نەبوون، فرۆشیاری ئەم بونەوەرانە پێکەنی و گووتی

((ئەو دەبێت لە ڕۆژی بیستەمی مانگی هەشتەمی مردبێت)) و ئێستا ڕۆژی دووەمی مانگی دەیەمە، بەڵام فرۆشیارەکە نەیدەزانی من لەماڵەوە کوانوویەکی غازیم هەیە و پلەی گەرمییەکەیم کردووەتە سەرووی ٧٥ پلەی فەهرەنهایت، هەر ئەمەش وایکردووە بونەوەرەکی من هێشتا لە کۆتاییەکانی مانگی یازدەشدا ئاواز بخوێنێت و من هیوا خوازم ئەو لە ساردترین مانگەکانی ساڵیشدا بە زیندووی بهێڵمەوە. بەهەرحاڵ هاوتەمەنەکانی ئەو بە ئەگەرێکی زۆر ئێستا هەموویان مردوون، ناتوانم بەهۆی ڕەزیلییەوە بەرەڵای بکەم بۆئەوەی هاوبەشێک بۆخۆی بدۆزێتەوە. تەنانەت ئەگەر ئەوەندەش چانس یاوەری بێت بتوانێت لە شەڕی هەموو دوژمنەکانی خۆی دەرباز بکات، دوژمنانی وەکو مێرولەکان، هەزار پێیەکان، جاڵجاڵۆکە ترسناکە زەمینییەکان، بە ئەگەرێکی زۆر تا شەو بە زیندووی نامێنێتەوە.

٩ – ئێوارەی ڕابردوو، لە بیست و نۆهەمین ڕۆژی مانگی یازدەیەم، کاتێک لەسەر مێزەکە دانیشتم هەستێکی نامۆم لا درووست بوو: هەستی خەڵوەتێک لە فەزادا، دواتر سەرنجمدا چەکاوەکەی من بەپێچەوانەوەی عادەتی دوبارەی خۆی ئەمجارە ئارام بوویەوە. بەدوای قەفەزە ئارامەکەیدا ڕۆشتم و بینیم لە کەناری پارچە بچوکە باینجانەکەدا لاربوەتەوە و مردووە، وا دەردەکەوت سێ و چوار ڕۆژ دەبێت هیچی نەخواردووە، بەڵام تەنها یەک ڕۆژ پێش مردنی بەشێوەیەکی سەیروسەمەرە ئاوازی خوێند منیش بەشێوەیەکی گەمژانە وا خەیاڵم کرد کە لە هەموو ڕۆژەکانی تر چالاکتر و بەویقار ترە. خوێندکارەکەی من کە ناوی

(ئاکی) کە عاشقی بونەوەرەکە بوو، بەردەوام خواردنی پێدەدا، بەڵام بڕیاریدا بوو بۆ کات بەسەر بردن بڕوات بۆ دێیەکەیان و ئەرکی خزمەتکردنی بونەوەرەکەی سپاردبوو بە (هانا)ی خزمەتکار، ئەو ژنێکی دڵسۆز نەبوو. دەڵێت فەرامۆشیم نەکردووە بەڵام قەفەزەکەی هیچ خواردنێکی تێدا نەبوو و ئەو تەنانەت نەهاتبوو بە مێشکیشیدا کە پارچەیەک پیاز یان خەیار بخاتە جێگەی باینجانە کۆنەکە! ... من لێپێچینەوەم لەگەڵ هانا کرد و لە کۆتاییدا دانی نا بە کارە نادرووستەکەی، بەڵام بەداخەوە ئیتر مۆسیقا جادوویەکەی لە کار کەوت، بێدەنگی ژوورەکەی داپۆشی بوو و ژوورەکە لەگەڵ گەرمایی غازەکەدا هێشتا سارد و خامۆشە.

١٠ – گەمژانەیە! ... کچێکی چاکم تووڕەکرد ئەویش لەبەر بونەوەرێک کە بە ئەندازەی دەنکە گەنمێکە! لەناوچوی ئەو ژیانە زۆر بچوکەکەی منی زیاتر لەوەی کە بیرم دەکردەوە توشی سەرئێشەی کردم، هەڵبەت عادەتی بیرکردنەوە لەبارەی لەدەستدانی بونەوەرێک، تەنانەت ئەوەندەی جیرجیرێک بێت، ڕەنگە بە ئەندازەیەک نابەجێ دیاربێت، لەکاتێکیشدا تازە ئیتر ئەومان لەدەست دابێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە بێدەنگی شەوە ئەفسوناوییەکە دڵگیرەکەی ئەوم هەستپێکردبوو کە پەیامی ژیانێکی نوێی پێیە و پەیوەستە بە ویست و ئارەزووە خۆویستانەکەی منەوە و نەک خواست و ویستی خوداوەند، ئەم دەنگە بە من دەڵێت ئەتۆمی ڕۆح لە قەفەزەی بچوکدا و ئەتۆمێکی ڕۆحی کە لە هەناوی

مندایە، هەمیشە یەکێک بوون و قوڵی هەناویان یەکێکە ... و دواتر بیرم لەو بونەوەرە بچوکە کردەوە کە بەدرێژایی شەوان و ڕۆژان برسی و تونون لە کاتێکدا بیری منی دەبردە خەیاڵ و ڕوئیایەکی قوڵەوە. بەڵام ئەو ئازایانە تا کۆتا هەناسەی ئاوازی خوێندەوە، کۆتاییەکی کارەساتباری هەبوو ئەو لە برسێتیدا پێیەکانی خۆی خواردبوو! داوادەکەم خودا لە گوناهەکانمان ببەخشێت بەتایبەتی گوناهەکانی هانای خزمەتگوزار!

١١ – بەمپێیەش هێشتا ناتوانین بڵێین ئەو ڕوداوەی ئاوازخوێندنەوە کە بەسەر ئەم بونەوەرەدا هاتووە خراپترین شتە، بەڵکو ئەوەیە کە لە تاوی برسێتیدا پێیەکانی بخوات. مرۆڤەکان جیرجیرێکن کە دەبێت دڵیان بخۆنەوە بۆئەوەی بتوانن ئاواز بخێنن.

وشە و دەستەواژە کلیلییەکان بۆ ئایدیا سەرەکی و لاوەکییەکانی چیرۆکی کیوسا و هیباری.

| | سەرەکی | لاوەکی |
|---|---|---|
| پەرگرافی یەکەم | ________ | ________ |
| پەرەگرافی دووەم | ________ | ________ |
| پەرەگرافی سێیەم | ________ | ________ |
| پەرەگرافی چوارەم | ________ | ________ |
| پەرەگرافی پێنجەم | ________ | ________ |

لە خوارەوە نموونەیەک لە وشە و دەستەواژە کلیلییەکان دەبینن کە لە یاداشتەکانی فێرخوازان وەرگیراون کە پێشتر ئەم ڕاهێنانەیان

ئەنجام داوە، بەکورتی لێکچوون و جیاوازییەکانی ئایدییاکانی ئەوان لەگەڵ خۆتاندا بەراورد بکەن.

**وشە و دەستەواژە کلیلییە پێشنییارکراوەکان لە لایەن فێرخوازانەوە.**

**پەرەگرافی یەکەم**

| | |
|---|---|
| سەرەکی | لاوەکی |
| قەفەزەکەی | دوو ئیجی ژاپۆنی |
| دەرگای دارین | دەسورێت |
| سەقفی تۆڕیی | مەودایەکی زۆر |
| بونەوەرێکی بچوک | دۆزینەوەی شوێنەکان |

**پەرەگرافی دووەم**

| | |
|---|---|
| جیرجیرەک | چەکاوەک چیمەن |
| ئەندازەی زێڕ | دوانزە سەنت |
| شاخ | بازاڕ |
| کیوسا – هیباری | وەکو مێشولە |

**پەرەگرافی سێیەم**

| | |
|---|---|
| خەوتن | خەیاری تازە |
| پاککردنەوەی خۆراک پێدان | ئێش و ئازار |
| سەرقاڵ بوون | بیرکردنەوە |
| گەمژە | بچوک |

**پەرەگرافی چوارەم**

| | |
|---|---|
| نەرم و بێدەنگ | چریکەی نەرم |
| مۆسیقا | ماڵ |
| زرنگانەوە | نەرم |
| ڕۆح | کاتی خۆرئاوا |
| بوون | |

**پەرەگرافی پێنجەم**

| | |
|---|---|
| عشق | ژیان لە شەودا |
| عاشقانە | فرۆشیاری مێشولە |
| تەپۆڵکە | گرنگی |
| مردن | عیشق و مەرگ |

دواتر مامۆستایانی وانەکە هێڵیان کێشا بە ژێر هەر وشەیەک لە پەرەگرافێکدا:

| | سەرەکی | لاوەکی |
|---|---|---|
| پەرەگرافی یەکەم | دەرگای تەختەیی | دۆزینەوەی شوێنەکان |
| پەرەگرافی دووەم | پێوان بە زێڕ | بازاڕ |
| پەرەگرافی سێیەم | بیرکردنەوە | ئێش و ئازار |
| پەرەگرافی چوارەم | نەرم | کاتی خۆرئاوابوون |
| پەرەگرافی پێنجەم | عیشق | ژیان لە شەودا |

دواتر پرسیار لە فێرخوازان کرا بۆچی ئەم وشە و دەستەواژانەیان لە ڕاهێنانی پەرەگراف و دەقەکە هەڵبژاردن، وشە و دەستەواژەکانی ترتان پشتگوێ خست. وەڵامەکان نزیکەی ئەمەی

لای خوارەوە بوو: وشەکان شێوەیەکی جوان و خەیاڵی، پیاهەڵدان، گونجاو، یادهێنەرەوە و یادگاریی، ... بوون.

لە نێوان پەنجا فێرخوازدا تەنها یەک فێرخواز درکی کرد کە بۆچی مامۆستایان ئەم دەستەواژانەیان لە دەقەکەدا هەڵبژارد: هەندێک هەڵبژێردراون لە ڕاهێنانی دەقەکەدا گونجاو نەبون.

بۆئەوەی هۆکاری ئەم کارە بزانین پێویستە بیر لە کاتێک بکەینەوە کە ماوەیەکی زۆر و ساڵانێکی زۆر بەسەر خوێندنەوەی چیرۆکەکەدا تێپەڕیوە، کاتێک کە دەتەوێت دووبارە تەماشایی یاداشتەکان بکەیتەوە بۆئەوەی دووبارە بابەتەکە بهێنیتەوە یاد، خەیاڵ بکەن هەندێک لە هاوڕێکانتان بۆ گاڵتە و خۆشی ڕۆشتوون هەندێک لە کارتەکانیی ناونیشانی هەندێک لە چیرۆکەکانییان دەرهێناوە و داوا لە ئێوە دەکەن ناونیشان و ناوی نوسەری چیرۆکەکانیان پێ بڵێیت. هیچ ئایدییایەک بە مێشکتاندا ختورە ناکات چونکە نازانن کارتەکان ئاماژە بەچی چیرۆکێک دەکەن و چونکە تەنها دەبێت کارتەکان ببین و بیخوێننەوە ئینجا وێنەی ڕاستی چیرۆکەکان بێتەوە یادتان.

بەو وشە کلیکییانەی کە لەسەرەوە نوسراون، ڕەنگە پێویست بکات بە یاسایەکانی خوارەوە ئەوانە پەیوەستبکەیت بەیەکەوە: (دەرگای تەختەیی) دەستەواژەیەکی گشتییە کە لەگەڵ دەستەواژەی (دۆزینەوەی شوێنەکان)دا دێت، پانتایی چیرۆکەکە ڕەمزئامێز دەکات. دوو وشەی کلیلی دیکە (پێوان بە زێڕ و بازاڕ) سەلمێنەری ئەم بابەتەیە و ئاماژە دەکات بەو بابەتەی کە نیشانی دەدات کارێکی تاوانکارانە لە ساتی ڕودانی دایە. سێ وشەی کلیلی دیکە (بیرکردنەوە، ئازار، نەرم) ڕەنگە ئەو وێنایە لای ئێوە درووست بکات کە یەکێک لە کەسایەتییەکان، ڕەنگە پاڵەوانی چیرۆکەکە،

کەوتووەتە ناو کێشە و دەردەسەرییەوە و هەر ئەمەش بوەتە هۆی ئەوەی ڕێڕەوی چیرۆکەکە ئاڵۆزی زیاتر بەدوای خۆیدا درووستبکات. کاتێک (کاتی خۆرئاوابوون) دێت کە بەشێوەیەکی ڕون گوزارشت دەکات لە ساتێکی ئاڵۆز و گوماناوی لە چیرۆکەکەدا، دوو وشەی کلیکی کۆتایی (عیش و ژیان لە شەودا) ئاماژەیەکی ڕۆمانسی و ئەویندارانەی بە هەموو پەیوەندییەکە درووستدەکات و ئێوە هاندەدات بەخێرای تەواوی وشە کلیلییەکانی تر بخوێننەوە بۆئەوەی بگەن بە تام و چێژی درێژەی چیرۆکە! ئێوە چیرۆکێکی قەشەنگی نوێتان درووستکردووە، بەڵام تەواوی چیرۆکە سەرەکییەکەتان بیرنەهاتووەتەوە.

ئەو وشانەی کە وادەردەکەوت زۆر باش بن بەڵام سەلمێندراوە کە لە مێشکدا نامێننەوە، بۆ ڕونکردنەوەی زیاتری ئەمە پێویستە قسەبکەین لەسەر جیاوازییەکانی نێوان وشە یادهێنەرەوە کلیلیەکان و وشە داهێنەرە کلیلییەکان و ڕێسایەک کە دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی کاتی زۆر هێشتا بەکاریگەرن، وشە یادهێنەرەوە باشەکان ئەمانەی خوارەوەن:

| | سەرەکی | لاوەکی |
|---|---|---|
| پەرەگرافی یەکەم | قەفەز | دوو ئینچ ژاپۆنی |
| پەرەگرافی دووەم | جیرجیر | چەکاوەک و چیمەن |
| پەرەگرافی سێیەم | خەوتن | خەیاری تازە |
| پەرەگرافی چوارەم | مۆسیقا | بەهای عاشقانە |
| پەرەگرافی پێنجەم | ئاواز | یادگەی ڕێکخراو |

تێگەیشتن لەوەی بۆچی ئەم وشانە باشتر دێنەوە یاد دەتوانێت لەسەر بنەمای تێگەیشتنی ڕێسا و یاسەیەک بێت کە تێیدا مێشکی مرۆڤ شیکردنەوە و شرۆڤە بۆ زانیارییە وەرگیراوەکان دەکات و لێکییاندەداتەوە.

**وشە کلیلییەکان - یادگە و داهێنان**

وشە و دەستەواژە یادهێنەرەوە کلیلییەکان ئەو وشە و دەستەواژانەن کە لە پانتاییەکی فراوان لە وێنەی تایبەت درووستدەکەن و کاتێک بەکاردەهێنرێن هەمان وێنە دەگوازنەوە. لە بارودۆخێکدا کە بەهۆی پەسنکردن و قەید و بەندە کلیلییە زۆرەکانەوە گەمارۆدراوە، دەیەوێت مانا تەواوەکەی لەدەست نەدات.




شێوەی ژمارە ٢٥ . هێلکارییەک کە وشە و دەستەواژەی یادهێنەرەوەی کلیلی نیشاندەدات.

وشەی ناوازە و داهێنەر ئەو وشەیەیە کە زۆر بەکاریگەر و وێنە درووستکەر و یادهێنەرەوەیە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی وشەگەلێکی یادهێنەرەوەی کلیلین. وشە گەلێکی وەکو (گوڵ، نامۆ،

سەرسوڕهێنەر، ...) تا ئاستێک سەرسوڕهێنەرن بەڵام بەگشتی شتێکی ئەوتۆمان بیرناخەنەوە.



شێوەی ژمارە ٢٦ . وشە یان دەستەواژەیەکی داهێنەری سەرەکی کلیلی (چەمک)، کە پەیوەندییەکی هەمەلایەن و بەرفراوان لە هەموو ئاراستەکانەوە درووست دەکات و وێنەیەکی گشتیتان پێدەدات لە بابەتەکە.

جیاواز لە تێگەیشتنی جیاوازی نێوان وشەی داهێنەران و یادهێنەرەوە، پێویستە لە ماهییەت و چییەتی خوودی ئەو وشە و عەقڵییەتە کە ئەوانە بەکاردەهێنێت، تێبگەین.

## ماهییەتی چەند لایەنە وشەکان

واتای چەند لایەنە ئەوەیە کە هەر وشەیەک وەکو ناوەندێکی بچووکە کە لەسەری قولابگەلێکی زۆر بچوک بوونیان هەیە، هەر قولابێک دەتوانێت بلکێتە وشەیەکی ترەوە بۆ ئەوەی دوو وشەمان پێبدات کە جووت وشەیەکی نوێ درووستبکەن و جیاوازییەکی واتایی بچوکیان هەبێ. بۆ نموونە وشەی (**چاک**)ە دەتوانێت بەشێوەیەکی تەواو جیاواز بلکێت بە قولابی بە دوو دەستەواژەی (**بەڵێ وایە و نایابە جێگەی پەسەندە**)، تەماشای دووەمین لاپەڕەی ڕەنگکراو بکەن.

لەگەڵ ماهییەتی چەند لایەنەی وشەکانیشدا، مێشکی هەر مرۆڤێک لەگەڵ مرۆڤێکی تردا جیاوازە، بەهەمانشێوە کە لە بەشی

یەکەمدا باسمان لێوەکرد ژمارەی ئەو پەیوەندییانەی کە مێشکێک دەتوانێت لە خۆیدا درووستییکات زۆر بێ سنووره، هەروەها ژیانی هەر مرۆڤێک زۆر جیاوازە لەگەڵ خەڵکانی تردا و تەنانەت ئەگەر دوو مرۆڤ سوود لە ئەزموونێکی یەکسان وەربگرن هێشتا لە دوو جیهانی جیاوازدان: (ئەلیف) لە ئەزموونی لەگەڵ (باء)دا وەکو بەشێکی پاڵپشتی ئەو بەهرە وەردەگرێت و هەروەها (باء)یش بەهەمان شێوە.

بەهەمان شێوە ئەو پەیوەندییانەی کە هەر کەسێک بۆ وشەکان درووستی دەکات جیاوازە لە کەسانی تر، تەنانەت وشەیەکی سادەی وەکو گەڵا، کۆمەڵێکی جیاواز لە وێنە بۆ ئەو کەسانەی کە دەیخوێننەوە یان گوێیان لێدەبێت درووست دەکات، کەسێک کە حەزی لە ڕەنگی سەوزە ڕەنگە سەوزاییە گشتییەکەی گەڵایەکان وێنا بکات، کەسێک کە ڕەنگی قاوەیی بەلایەوە جوان و سەرنجڕاکێشە، جوانی و ناسکی پایز، کەسێک کە لەسەر درەخت و دارەوە کەوتووەتە خوارەوە و بەسەختی بریندار بووە، هەستی ترس، و باخەوانێک کە هەستێکی خۆش دێتەوە یادی کاتێک کە چێژی لە تەماشاکردنی گەشەکردنی درەختەکان دەبینی و بیری لەوە دەکردەوە دەبێت گەڵا وەریوەکان کۆبکاتەوە وە هەروەها چەندین نموونەی تر. ئەم کارە دەتوانێت هەمیشە بەردەوامی هەبێت لە کاتێکدا هێشتا ئاماژە نەکراوە بەو وێنەیەی کە بە بینینی وشەی گەڵا لە مێشکتاندا ختووره دەکات.

نەک تەنها مێشک سوود لە ڕێسایەک لە توانا ناوازەکانی بۆ تێگەیشتنی وێنە کەسییەکان وەردەگرێت، بەڵکو هەموو مێشکێک بە سروشتی خۆی داهێنەرە و ڕێکخستنێکی باڵای هەستەکی هەیە، مێشک دەتوانێت چیرۆکە قەشەنگ و سەرگەرمییەکان بۆخۆی

درووستبکات، بەهەمانشێوەی کە ئێمە شەو و ڕۆژ لە خەیاڵ و بیرکردنەوەداین.

هۆکاری بوونی بەربەست لە توانای یادهێنانەوە و هەڵبژاردنی وشە گشتییەکان لە چیرۆکی کیوسا و هیباری، ئێستا دەتوانین بەباشی تێبگەین. کاتێک هەریەک لە وشە و دەستەواژە چەند لایەنییەکان لێکنزیکدەبنەوە، لە ڕاستیدا مێشکمان بەشێوەیەکی ناخوود ئاگایانە قولابە پەیوەستەکان هەڵدەبژێرێت کە ڕوونتری دەکاتەوە، وێنایەکی چاکتر نیشاندەدات و هەستێکی تایبەت لە ئێوەدا درووست دەکات، لە ئەنجامدا مێشک بەدەوری ناوەندێکدا دەخولێتەوە کە داهێنەرە نەک وشە یادهێنەرەوەکان.

وشە یادهێنەرەوە کلیلییەکان، مێشک ناچار دەکات پەیوەندییە گونجاوەکان لە ئاراستە و لایەنی درووستدا بهێنێتەبون، ئەو توانایەی پێدەدات کە بەبێ گەڕانەوە بۆ هەر هۆکارێکی ناسراو کە ببێتە هۆی فەرامۆشکردنی بابەتەکان، دووبارە چیرۆکەکە بخولقێنێت.

### وشەی کلیلی – وێنە عەقڵییەکان لە بەرامبەر یاداشتە ستانداردەکان

چوارچێوەی سەرەکی یادگەی مرۆڤ لەم ماهییەت و واتا کلیلییەوە درووستبووە، هەمانشێوە کە دەردەکەوێت ئەم پرۆسەیە زۆر دەقیق و وشە بە وشە نییە، کاتێک مرۆڤەکان کتێب دەخوێننەوە یان شوێنێک دەبینن وەسف و باسی لێوە دەکەن لە ڕاستیدا دەستناکەن بە خوێندنەوەی یەکسەری یادگەیان، ئەوان باسێکی کورت لە چەمکە کلیلییەکان دەخەنەڕوو کە پێکهاتوە لە کەسایەتییەکان شوێن و کات و ڕووداوە سەرەکییەکانە و لایەنە

لاوەکییەکان وەسفێکی زیاتر بە چیرۆکەکە دەدەن. هەروەها وشە و دەستەواژە کلیلییەکان چوارچێوەیەکی بەرفراوانی لە ئەزموون و هەستی لەگەڵدایە. بۆ نموونە بیر لە چوارچێوەیەکی خەیاڵ و وێناکردن بکەنەوە کاتێک وشەی (منداڵ) دەخوێننەوە چی دێت بە مێشکتاندا.

چۆن قبوڵکردنی ئەم ڕاستییە سەبارەت بە یادهێنانەرەوە کلیلییەکان لە ڕوانگەی ئێمەوە دەربارەی بونیادی یاداشتکردن کاریگەریی دەبێت؟

لەوەی کە ئێمە عادەتێکی زۆرمان کردووە بە وشە گوفتاریی و نوسینییەکان، بە هەڵە وا خەیاڵ دەکەین کە بونیادی ساکاری ڕستە باشترین ڕێگایە بۆ یادهێنانەوەی وێنا و ئایدییا زمانەوانییەکان، کەواتە زۆربەی فێرخوازان و تەنانەت دەرچوانی زانکۆش زۆرکات بەشێوەیەکی ئەدەبی یاداشتی دەکەن کە هاوشێوەی یاداشتکردنی خوێندکارانە کاتێک مامۆستایان دوای سەحدانی وەڵامەکانییان نمرەیەکی باشییان پێدەدەن.

ئەو زانییاری و مەعریفە نوێیەی ئێمە سەبارەت بە واتا و یادهێنانەوە کلیلییەکان نیشانی داوە لەم جۆرە یاداشتانەدا زیاد لە ٩٠ لە سەدی وشەکان بە ئاسانی نایاتەوە یادمان، ئەم ژمارەیە بەرزە نیگەرانیکەرە، زۆر نیگەرانکەرتر دەبێت کاتێت تەماشایەکی زۆر ورد و دەقیقتر بە ڕستە کورتکراوە ستانداردەکان دەکەین:

١ – کاتەکان بەهەدەر دەدرێن لە پێناو جێگیرکردن و خەزنکردنی ئەو وشانەی کە بە زەحمەت لە یادگەماندا دەمێننەوە. (بەفیڕۆدانی کاتی خەملێندراو ٩٠ لە سەدە)

٢ – ئەوکاتەی کە تەرخاندەکرێت بۆ خوێندنەوەی هەمان وشەگەلی ناپێویست. (بەفیڕۆدانی کاتی خەملێندراو ٩٠ لە سەدە)

٣ – کاتێکی زۆر تەرخاندەکرێت بۆ تاوتوێی ئەو وشانەی کە یادهێنەوەیەکی کلیلین، چونکە بەزۆری لەگەڵ هیچ هێمایەکدا جیاوازنین و کەواتە لەگەڵ وشەکانی تردا ئاوێتە دەبێت، بە سەختی دە دۆزرێنەوە.

٤ – پەیوەندیی نێوان وشە یادهێنەرەوە کلیلییەکان، لەگەڵ ئەو وشانەی کە ئەوان جیادەکاتەوە دووچاری لەناوچوونییان دەکات، ئێمە دەزانین یادگە ئیشی درووستکردنی پەیوەندییە لە نێوان وشەکان و بوونی وشەی هەڵقورتێنەری تر دەبێتە هۆی ئەوەی پەیوەندییەکە سست و لاوازبێتەوە.

٥ – وشە یادهێنەرەوە کلیلییەکان، بەهۆی وشە نێوەندییەکانەوە لێکدەترازێن، دوای خوێندنەوەی یەک وشە یان دەستەواژەیەک چەند چرکەیەک دەبات تا وشە و دەستەواژەیەکی تر دەخێنینەوە.

تا زیاتر مەودای کاتی لە نێوان پەیوەندییەکاندا زۆرتر بێت، چانسێکی کەمتر هەیە کە پەیوەندییەکی گونجاو درووست ببێت.

٦ – وشە یادهێنەرەوە کلیلییەکان، لە مەودایەکی تایبەت لە یەکتر قەراریان گرتووە، هاوشێوەی ئەوەی کە سەبارەت بە کات

خستمانەڕوو، مەودای زۆر لە نێوان وشەکاندا دەبێتەهۆی ئەوەی کە چانسێکی کەمتر هەبێت کە پەیوەندییەکی گونجاو درووست ببێت.

ئامۆژگاری ئێوە دەکەم ڕاهێنان بکەن لەسەر هەڵبژاردنی ئەو وشە و دەستەواژە یادهێنەرەوە کلیلییانەی کە لەو یاداشتانەی کە پێشتر لە کاتی خوێندنەوەدا هەتان بووە. هەروەها باشتر وایە وشە کلیلییەکانی ئەم بەشانە کورتبکەنەوە.

هەروەها وشە یادهێنەرەوەکان و وشە داهێنەرە کلیلییەکان لە پرشنگی زانیارییەکان لە بەشی یادگە بخوێننەوە و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی بۆ بکەن بەتایبەتی ئەو لایەنەی کە پەیوەستە بە بنەماکانی بەهێزکردنی یادگەوە، بەهەمان شێوەی بەشی یادگە دەتوانن لە پرشنگی زانیارییەکانی ئەم بەشەدا بگەن بە هاوشێوەیەک لە نێوان پەیوەندی و لێکچونەکانی نێوان سیستەمەکانی بەهێزکردنی یادگە و واتا کلیلی و داهێنەرەکان.

کاتێک یاداشتەکان بەشێوەی وشەی کلیلیین پێداچونەوە و دووبارە بەسەرداچونەوەی ئەوانە زۆر ئاسانترە، چونکە کاتێکی کەمتر لە دووبارە خوێندنەوەی بابەتەکە بەهەدەر دەدەن و یادهێنانەوەیەکی باشتر و کامڵترتان بۆ درووست دەبێت. هەروەها پەیوەندییە لاوازەکانی یەکەم هەنگاو پترتر و ڕێکخراوەیی تر دەبێتەوە.

لە کۆتاییدا پەیوەندیی لە نێوان وشەکان و واتا یادهێنەرەوە کلیلییەکان دەبێت هەمیشە جەخت و پێداگیری لێبکرێتەوە و نابێت لە بارودۆخە پێویستەکاندا خۆمان بەدوور بگرین لە ئامادەکردنی لیست و هاوکێشە سادەکانی وشە کلیلییەکان.

## وێنەی عەقڵی کیوسا و هیباری



نموونەیەك لە تێبینییەکانی خوێندکارێك کە بە شێوەی چاولێکەری باش دەنرخێندرێت

## بۆ پێشەوە

لە بەشی دواتردا ڕێساکانی پێشکەوتن و گەشەی پەیوەندیی و مۆدێلەکانی وشەی یادهێنەرەوە بەشێوەیەکی زۆر گشتگیرتر و وردتر دەخەینەڕوو و ڕوونی دەکەینەوە، ئەم تەکنیکە پێیدەگوترێت وێناکردنی عەقڵی یان مێشکی.

## بەشی حەوتەم

# وێنە عەقڵییەکان - یاسا سروشتییەکان

**پێداچونەوە**

- **ڕاهێنان - گەشت لە فەزا**
- **مێژووی درێژی گوفتار و چاپ**
- **مێشکی ئێوە و وێنەگرتنی عەقڵی**
- **یاساکانی وێنە عەقڵییەکان**

بەشی حەوت باس لە ماهییەت و چییەتی ناڕاستەهێڵی مێشکی ئێمە دەکات، بەلەبەرچاوگرتنی ئەو بابەتە سوودەکانی وێنا عەقڵییەکان ڕوندەکەینەوە.

**ڕاهێنان - گەشت لە فەزا (بۆشایی ئاسمان)**

گوفتارێکی نیو کاتژمێری سەبارەت بە بابەتی گەشتکردن بۆ ئاسمان لەسەر لاپەڕەی کاغەزێک بنوسن، هەر ئێستا کارەکەتان بە تەواوکردنی ئەم پەرەگرافە دەستپێبکەن، ئەو کاتەی کە بۆتان تەرخانکراوە دەبێت ئەم گفتوگۆیە ئامادەبکەن کەمترە لە پێنج خولەکە، ئەوە گرنگ نییە کارەکەتان تەواوکردووە یان نا، لە کۆتایی

ئەم بەشەدا ئاماژە بەم ڕاهێنانە دەکەین، بەهەمانشێوە ئەو کێشە و گرفتانەی کە لە درووستکردنی پەیوەستی لەگەڵ ڕێکخستنی فیکریدا لە ئەنجامی ئەم کارەدا ئەزمموونتان کردووە.

ئەو کێشانەی کە ڕووبەڕووت بوونەتەوە.

**مێژووی درێژی گوفتار و چاپ**

لەم چەند ساڵەی کۆتاییدا، باوەڕوابوو کە عەقڵی مرۆڤ وەکو ڕاستەهێڵ یان هاوشێوەی لیستکردن کاردەکات، ئەم باوەڕە لە سەرەتاوە درووستبوو چونکە جەختێکی زۆر لەسەر دوو تەکنیکی سەرەکی پەیوەندیی کرابوویەوە واتا پەیوەندیی گوفتار و چاپکردن. ماهییەتی کات و شوێن بوەهۆی ئەوەی گوفتار سنووردار ببێتەوە، چونکە لە یەک ساتدا دەمانتوانی گوێمان لە وشەیەک بێت یان بیلێین، کەواتە گوفتار وەکو پرۆسەیەکی ڕاستەهێڵ و هێڵدار لەناو خەڵکیدا ناسێندرا. (شێوەی ٢٨ تەماشا بکەن).



شێوەی ژمارە ٢٨ . گوفتار بەشێوەیەکی نەریتی وەکو پرۆسەیەکی ڕاستەهێڵ و هێڵدار دەناسرێت.

پرێنت و چاپکردن تەنانەت هێشتا هێڵدار تر دێتەپێشچاو، نەک تەنها کەسەکە ناچاردەبێت وانە چاپکراوەکان بە ڕیز و یەک لەدوای یەک بخوێنێن، بەڵکو لاپەڕە چاپکراوەکان بەشێوەی کۆمەڵێک هێڵ دانراون.

ئەم جەختکردنەوەی هێڵییە لە پرۆسە و کرداری نوسین و یاداشتکردنی ئاسایشدا دەبینرێت، هەموو فێرخوازان بەشێوەیەک فێرکراون کە ڕستە و لیستەکان بەشێوەیەکی ستوونی بنوسن. زیاتر خوێنەران بەئەگەرێکی زۆر دەقی گوفتاری نێو کاتژمێرییان بەهەمان شێوەی کە لە شێوەی ٢٩ دا نیشاندراوە، بەیەکێک لەم دوو تەکنیکە ئامادەکردووە. قبوڵکردنی ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە ئەوەندە کۆن و نەریتییە کە هێشتا هەوڵێکی کەم بۆ ڕەدکردنەوە و بەرپەرچدانەوەی خراوەتەگەڕ. بەهەرحاڵ بەڵگەگەلێکی زۆر هەن کە نیشانی دەدەن مێشک چەندین ڕەهەند و فۆڕمی هەیە و لاوازی سەرەکی و بنەڕەتی لە بابەتە گوفتاری و نوسینەکییەکاندا هەیە.

ئەو بەڵگەیەی کە دەڵێت مێشک بەهۆی مۆدێلە گوفتارییەکانەوە بەشێوەیەکی ڕاستەهێڵ و هێڵدار کار دەکات، ڕەدکراوەتەوە و بەهەمانشێوەی تیۆریای ماهییەتی بەبێ مەرج و قەیدی تێستەکانی IQ ئەمیش نەبوە جێگای ڕەزامەندی ڕەخنەگران و هەر زوو بەرپەرچ درایەوە. پێویستە ئەوە بێنینە یاد وشەکان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بەشێوەیەکی ڕاستەهێڵ دەگوازرێتەوە بەڵام خاڵی سەرەکی ئەمە نییە بەڵکو خاڵی سەرەکی ئەو پرسیارەیە: چۆن

مێشکێک کە خەریکی قسەکردن و مێشکێک کە قسەکان وەردەگرێت، بەشێوەیەکی ناخوود ئاگا لەگەڵ وشەکاندا پەیوەند دەبن؟

وەڵامەکەوە ئەوەیە کە دەتوانین بە دڵنیاییەوە ئەوە بڵێین مێشک لەگەڵ وشەکاندا بەشێوەی لیست و ڕاستەهێڵ پەیوەندیی نابەستێت.

ئێوە دەتوانن ئەم ڕاستییە بە بیرکردنەوە لە شێوازی کارایی پرۆسەی بیرکردنەوەی خۆتان لەکاتی قسەکردن لەگەڵ خەڵکیدا بسەلمێنن. سەرنجدەدەن کە ئەگەرچی تەنیا یەک هێڵ لە وشەکان دێنەسەر زمان و دەگوترێن، لەکاتی گفتوگۆکردن لەگەڵ خەڵکانی تردا پرۆسەیەکی دووبارەبووەوە و زۆر ئاڵۆز لە پۆلێنبەندی و هەڵبژاردن لە مێشکدا درووست دەبێت. هەموو تۆڕەکانی وشە و ئایدیاکان لەگەڵ یەکدا هەماهەنگ و ئاوێتە دەبن بۆئەوەی واتایەکی تایبەت بگوازنەوە بۆ گوێگر.

ئەلیف – هێڵی ئاسایی لەسەر بنەمای بونیاد – ڕستە

باء – لیستی ستاندارد لەسەر بنەمای بونیاد – ڕێزبەندی گرنگی

شێوەی ژمارە ٢٩ . شێوە ستانداردەکانی یاداشتە باشەکان یان ڕیزکراو.

بەهەمان شێوەی ڕێکخستن گوێگر تەنها لیستێکی درێژ لە وشە تێبینی ناکات، کە کەسێک وەکو ماکارۆنی هەڵیانلۆشێت، ئەو هەر وشەیەک لەگەڵ ئەو دەقەیدا کە لە دەوریدایە کۆدەکاتەوە و واتای پێدەدات، هەر لەوکاتەدایە کە شیکردنە و واتا دەدات بە ماهییەتی فرە ڕەهەندی وشەکان. شیکردنەوە و واتایەک کە لەلایەن بونیادی مۆدێلی زانیارییەکانی کەسەکەوە دەرچوە، لەپاشاندا دەستدەکات بە ڕاڤە و هەڵێنجان و هەڵسەنگاندن و هێمادانان و ڕەخنە لە پرۆسەکە.



شێوەی ژمارە ٣٠ . ئەو تۆڕە پەیوەندییەی کە لە مێشکی مرۆڤدا هەیە، بۆ تێگەیشتنی شێوازی پەیوەندیی وشەکان گرنگە و نەک ڕیزکردنێکی یەک لە دوای یەکی سادەی وشەکان.

دەقی لاپەڕە کانی ١١-١٠٩ تەماشابکە.

ڕەنگە هەندێک کات سەرنجی ئەوەتان دابێت کە هەندێک بەشێوەیەکی لەناکاو کاردانەوەیەکی زۆر توندییان هەبێت بۆ ئەو وشانەی کە ئێوە وا هەستان دەکرد زۆر سادە و بێواتان. ئەوان بەو شێوەیە کاردانەوە دەنوێنن چونکە ئەو پەیوەندییانەی کە ئەوان لەم وشانە هەڵهێنجانی بۆ دەکەن زۆر جیاوازە لە بۆچونی ئێوە. زانینی ئەم ڕاستییە یارمەتی ئێوە دەدات کە ڕوونتر تێبگەن لە ماهییەتی گفتوگۆ، نەگونجاندن و هەڵە لێکتێگەشتن.

ئەو بەڵگەیەی کە بۆ چاپکردن خرایەڕوو، بەڵگەیەکی لاوازە. لەگەڵ ئەوەی کە ئێمە وا فێرکراوین هەموو یەکە زانیارییەکان یەک لە دوای یەک بخوێنین و ئەو زانیارییانە بەشێوەی ڕاستەهێڵ خراونەتەڕوو و ئێمەش دەبێت ئەو زانیارییانە بەشێوەیەکی ڕاستەهێڵ و یەک لە دوای یەک بە ڕیزکراوی بنوسین و یاداشتییان بکەین، بەڵام خستنەڕووی زانیارییەکان بەشێوەی خەتێکی ڕیزکراو و ڕاستەهێڵ هیچ پێویست نییە و زۆرکاتیش وەکو خاڵێکی لاواز تەماشادەکرێت.

مێشکی ئێمە بە تەواوەتی ئەو توانا و دەسەڵاتەی هەیە زانیارییەکان وەربگرێت کە هێڵداریش نین، لە ژیانی ڕۆژانەدا مێشک ئەم کارە ئەنجام دەدات، هەموو ئەو شتانەی کە لە دەوروبەرمانن و تێبینی و سەرنجی هەموو فۆڕم و شێوە جیاوازەکانی ناڕاستەهێڵ دەدات و لێیانتێدەگات وەکو دیمەنەکان، وێنەکان، هێڵکاریی و نەخشەکان و دەیان شتی دیکەش.

لە کۆمەڵگای ئێمەدا زیاتر جەخت لەسەر زانیارییە ڕاستەهێڵییەکان دەکرێتەوە گرنگی بەم لایەنە دەدرێت، تایبەتمەندی ناڕاستەهێڵی مێشکی ئێوە لەلایەن توێژینەوەکانی ئەم دوایانەوە لە بوارەکانی دەروونناسی، بایۆلۆجی، فیزیۆلۆجی، بایۆکیمیکەوە پشتڕاستکراونەتەوە، هەموو بوارە زانستییەکان کە بەشێوەیەکی بابەتی و ئەکادیمی توێژینەوەیان ئەنجامداروە گەشتوون بە کۆمەڵێک دەرەنجامی گرنگ و لەوانەش سەبارەت بە مێشک باوەڕیان وایە نەک تەنها ڕاستەهێڵ نییە، بەڵکو بەتەواوەتی ئاڵۆز و پێچاوپێچ و بەیەکەوە گرێدراون و هەموو توێژینەوەکانی پێشووتر ڕەتدەکەنەوە.

## مێشکی ئێوە و وێنەگرتنی عەقڵی

ئەگەر قەرار وابێت مێشک بە ڕێسایەکی کاریگەرتر پەیوەندیی درووست بکات لەگەڵ زانیارییەکاندا، دەبێت زانیارییەکان بەشێوەیک ڕێکبخرێن تا ئاستی گونجاو بەئاسانی لەوێدا جێگیر ببن، دەتوانین بگەین بەو دەرەنجامەی کە ئەگەر مێشک لە سەرەتاوە لەگەڵ واتا و چەمکە کلیلییەکاندا بە ڕێسایەکی هەماهەنگ و پەیوەست کار بکەن، یاداشت و پەیوەندیی وشەکانی ئێمە دەبێت لە زۆربەی بوارەکاندا لەگەڵ ئەو ڕێسایەدا ڕێکبخرێت لەبری ئەوەی لە ڕاستەهێڵی نەریتیدا قەراربگرێت.

باشتروایە لەبری دەستپێکردن لە سەرەوەی لاپەڕەکەوە و خوێندنەوەی ڕستەکان و لیستەکان، لە ناوەڕاستەوە بە ئایدە و بیرۆکەی سەرەکی دەستپێبکەن و سوود لە ئایدە و بیرۆکە ناوەند و کاکڵە و دەوروبەرییەکان وەربگرن و بەهەمانشێوەی کە پێشتر باسمان لێوەکرد لق و پۆپ و قولابی بۆ دروووست بکەن.

١ - کاتێک ئایدەی سەرەکی لە ناوەندایە پێناسەیەکی ڕونتر پیشاندەدات.

٢ - گرنگی ڕێژەیی هەر ئایدەیەک ئاسانتر دەخێتەڕوو، ئایدە گرنگەکان نزیکن لە ناوەندەوە و ئەو ئایدانەی کە گرنگییەکەیان کەمترە دەچنە سوچ و گۆشە و کەنارەکان.

٣ - پەیوەندیی لە نێوان چەمک و واتا کلیلییەکاندا بەخۆی نزیکایەتیانەوە بەتەواوەتی دەتوانرێت دیارییبکرێت.

٤ - لە ئەنجامی ئەوەی سەرەوەدا، یادهێنانەوە و پێداچونەوە کاریگەرتر و خێراتر دەبێتەوە.

٥ – ماهییەتی ئەم بوونیادە ئەو توانایەمان پێدەدات بەبێ ئەوەی وشەکان بەشێوەیەکی نارێکخراو بسڕینەوە یان کاتێکی زۆر بەهەدەر بدەن، زانیارییە نوێیەکان لەسەر وێنە عەقلییەکە زیاد بین.

٦ – وێنەی عەقڵی هەموو مرۆڤەکان جیاوازن لە یەکتری و هیچ مرۆڤێک لەوی تر ناچێت، ئەم بابەتە زۆر گرنگە ئاگادار بن.

٧ – لە بوارە گرنگ و داهێنەرانەکانی تردا وەکو (نوسینی راپۆرت و توێژینەوەی زانستی، ...). ماهییەتی کراوە و بێسنووری وێنەکە، ئەو توانایە ئەدات بە مێشک کە پەیوەندییە نوێیەکان بەشێوەیەکی رێکخراو ئاسانتر بکاتەوە.

شێوەی ژمارە ٣١ .پێشنیاری دەسپێکی هزر لە بارەی ناوەندی دەروونەوە.

سەبارەت بەم خاڵانە و بەتایبەتی بابەتی کۆتایی ئێستا دەبێت ڕاهێنانێکی هاوشێوەی گفتوگۆکردن دەربارەی گەشتکردن بۆ بۆشایی ئاسمان ئەنجام بدەن، کە لە سەرەتای ئەم بەشەدا باسمانکرد، بەڵام ئەمجارەیان لە بری ڕێسا ڕاستەهێڵییەکان سوود لە وێنە عەقڵییەکان وەربگرن، پێڕەوی لە یاسایەکانی وێنە عەقڵییەکان بکەن.

**یاساکانی وێنە عەقڵییەکان**

١ – بەیەک شێوەی ڕەنگکراو لە ناوەندەوە دەستپێبکەن.

بەزۆری شێوە (وێنا) بە ئەندازەی هەزاران وشە بایەخی هەیە و لە کاتێکدا بەشێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش یادگەمان بەرزتر دەکاتەوە، ئەبێت بە هاندەرتان بۆئەوەی مێشکێکی چالاکترتان هەبێت. کاغەزەکە لە جێگەیەکی گونجاودا دابنێن.

٢ – دیمەنێک لە وێنەی عەقڵتان

هەروەکو ژمارە یەک و بەمەبەستی گەشەکردنی تەواوی کارایی چینەکانی مۆخی مێشک، سەرنجی چاوتان سەر بابەتێک داگرن و یارمەتی یادگەتان بدەن.

٣ – دەبێت وشەکان بنوسرێن

ئەگەر بمانەوێت دووبارە دەقێک (پەرەگرافێک) بخوێنینەوە، وشە نوسراوەکان ڕونتر و ئاسانتر دەبنەوە و تێگەیشتن و درکێکی باشترمان پێدەدات. ئەو کاتە دیاریکراوەی کە تەرخاندەکرێت بۆ نوسینی وشەکان دەبێتە هۆی ئەوەی لە کاتی پێداچونەوەدا ڕێگری بکات لەکات بە هەدەردان.

٤ – دەبێت وشە نوسراوەکان لەسەر هێڵبن و دەبێت هەر هێڵێک پەیوەست بکرێت بە هێڵەکانی ترەوە.

ئەمە دەبێت ئەوە زامنبکات کە وێنەی عەقڵی بونیادێکی سەرەکی هەیە.

٥ – وشەکان دەبێت (تاک)بن، بۆ نموونە یەک وشە لە یەک هێڵدا

ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی هەر وشەیەک قولابگەلێکی زۆری هەبێت، چونکە دەبێت بۆ یاداشتکردن، ئازادیی و نەرمی و سازانێکی زیاترمان هەبێت.

٦ – لە وێنەی عەقڵیدا دەبێت سوود لە ڕەنگەکان وەربگرین

چونکە ئەوانە یادگە بەهێز دەکەن، چاوەکان ماندوو ناکەن و دەبێتە هۆی گەشەکردنی کارایی درووستی چینەکانی مۆخی مێشک.

٧ – لە هەوڵە داهێنەرەکانتان دەبێت تا ئاستی توانا ئەم جۆرە عەقڵە ئازاد و ڕەها بکرێن

هەر خەیاڵێک سەبارەت بە شوێنێک کە دەبێت شتەکان بڕۆن یان ئەوەی ئەوانە لە وێنەی عەقڵیدا بن یان نا، پرۆسەکە سست و لاواز دەکات.

ئامانجی سەرەکی ئەوەیە کە مێشکتان هەموو ئەو شتانە بهێنێتەوە یادی کە پەیوەندیی بە ئایدەی ناوەندەوە هەیە، چونکە درووستبوونی ئایدەکان لە مێشکدا زۆر خێراترە لە نوسینی ئەوانە، نابێت هیچ وەستانێک ڕوویدات، ئەگەر وەستان ڕوویدات ئەوکاتە خۆتان سەرنج دەدەن کە پێنوسەکە چۆن لەسەر کاغەزەکە دەلەرزێت. هەرکاتێک دووچاری ئەم حاڵەتە بوون بگەڕێنە دواوە و دووبارە دەستپێبکەنەوە.

نیگەرانی ڕیزکردن و ڕێکخستنییان نەبن، چونکە زۆربەی کات ئەم ڕێکخستن و پلەبەندییە خۆی درووست دەبێت، ئەگەر بوونی نەبوو دەتوانن لە کۆتای ڕاهێنانەکەدا بابەتەکان ڕێکبخەن.

بەهەمانشێوەی کە ڕونمانکردەوە دەتوانین درکی ئەوە بکەین کە سوود لە وێنەی عەقڵی دەگیردرێت بۆئەوەی هەموو خەوشییەکانی یاداشتکردنی ستانداردەکە کە لە کۆتایی بەشی شەشەمدا باسمان لێوەکردن نەمێنێت.

لە خوارەوە سوود لە یاسای وێنەسازی عەقڵی وەربگرن بۆئەوەی ئەو ڕێسایەی کە خستمانەڕوو وێنەیەکی عەقڵی تایبەت بە گوفتاری خۆتانی پێ ئامادە بکەن.

هەر ئێستا دەستپێبکەن.



ئامادەیی کلێشەی عەقڵی دەربارەی(خۆتان)

ئەگەرچی پێدەچێت ئەم هەوڵە سەرەتاییە بۆ ئامادەکردنی وێنە کەمێک نائاسایی بێتە پێشچاو، بەدڵنیاییەوە تێگەشتوون کە ئەم ڕاهێنانە کە مێک جیاوازترە لە ڕاهێنانی یەکەم و گرفتەکانیشیان بەزۆری جیاوازن لە یەکدی.

| | |
|---|---|
| دیسپلین | ڕێکخستن |
| بەردەوامی | دابەشکردنی کات |
| دەستپێک | جەتکردنەوە لەسەر ئایدەکان |
| کۆتای | ڕێگری عەقڵی |

ئەم کێشە و گرفتانە دروستدەبن، چونکە خەڵکی هەوڵدەدەن ناونیشانی بەشەکان و ئایدە سەرەکییەکان یەک لە دوای یەک هەڵبژێرن و هەولیش دەدرێت لە کاتی کارەکەدا ئەوانە ڕێک و ڕیزبکات، ئەوان هەولی ئەوە دەدەن کە بونیادی گوفتار ڕێکبخەن بەبێ ئەوەی هەموو زانیارییە پێشکەشکراوەکان بەکاربهێنن، ئەم کارە بەناچاری دەبێتە هۆی دروستبوونی ئەو سەرگەردانی و گرفتانەی کە ئاماژەمان بۆی کرد. زانیارییە نوێیەکان کە دوای بابەتە یەکەمییەکەوە دێن ڕەنگە بەشێوەیەکی لە ناکاو تێڕوانین سەبارەت بە هەموو بابەتەکە بگۆڕن، ئەم جۆرە ڕوداوانە بەشێوەیەکی ڕاستەهێڵ تێکەڵی و پێکەڵی و ئاڵۆزی دروستدەکات. لە کاتێکدا لە شێوەی وێنەی عەقڵیدا تەنها بەشێکە لە پرۆسە گشتییەکە و دەتوانێت بەشێوەیەکی گونجاو و جێگیر ئەوانە کۆنترۆڵ بکات.

لاوازییەکی تری شێوازی ڕاستەهێڵ و لیستی ئەوەیە کە ڕێساکەی پێچەوانەی ڕێسای مێشکە، هەر کاتێک بیر لە ئایدەیەک دەکەینەوە یەکسەر لیستی دەکات و کاتێک ئایدەیەکی تر عەقڵ و بیرکردنەوەی ئێمە سەرقاڵ دەکات بابەتی پێشووتر فەرامۆش و لەبیردەکەین. ئەمە بەو واتایەیە کە کاتێک مێشک لە تاوتوێی

ئایدەیەکی نوێیدایە، هەموو ئەگەرە چەندڕەهەندییەکان (چەند لایەنەکان) و پەیوەندیی وشەکان لە ناو دەچن و ئازاد دەبن.

لەگەڵ شێوەی وێنەی عەقڵی هەر ئایدەیەک وەکو ئەگەرێکی کراوە ئازاد دەبێت بۆئەوەی وێنەکە بەشێوەیەکی سروشتی و فراوان گەشەبکات نەک ئەوەی کە سەرکووت و خاپوور بێت.

ڕەنگە بیربکەنەوە کە باشتر وایە هەوڵەکانتان بەراوردبکەن بە هەوڵەکانی سێ فێرخوازی دیکە، بۆئەم مەبەستە ئێمە سێ نموونەمان لە خوارەوە خستووەتەڕوو.

نموونەی یەکەم: نوسینێکی ئاسایی کوڕێکی ١٤ ساڵانە، کوڕێک کە بەشێوەیەکی سروشتی زرنگ دیارە، بەڵام نارێکخراو و لەڕووی عەقڵییەوە نارێک و پێکە. ئەم نموونەی نوسینی ڕاستەهێڵییە ئەو باشترین یاداشت نیشان دەدات و بەشێوەیەکی دیار ڕوونی دەکاتەوە کە بۆچی بەمشێوەیە ڕاڤە و وەسفکراوە. وێنەی عەقڵی ئینگلیزی کە تێیدا پێنج خولەک تەواوکراوە، بەزۆری بەشێوەیەکی تەواوەتی پێچەوانەی ئەمە نیشاندەدات و پێمان دەڵێت کە ئێمە بەزۆری کاتێک داوا لەو دەکەین بە سوود وەرگرتن لە ڕێسایەکی تایبەت خۆی دەربخات، تێڕوانینێکی نادرووستمان بۆی دەبێت.

نموونەی دووەم: وێنەی عەقڵی کوڕێکە کە دووجار لە تاقیکردنەوەی ئابووری دەرنەچووە و مامۆستایەکەی باوەڕی وایە ئەم خوێندکارە کێشە و گرفتێکی ئاڵۆزی هەیە لە بیرکردنەوەدا و ناتوانێت بە ئاسانی بابەتەکان فێرببێت و زانیارییەکی زۆر کەمی لەسەر بابەتەکان هەیە، هەروەها وێنەی عەقڵی کە لە پێنج خولەکدا ئامادەکراوە، شتێکی دیکە نیشاندەدات.

7) SETTING  Time + places in which the novel is situated
8) IMAGERY  One kind of images the author uses to describe (usually by simile or metaphor)
9) SYMBOLISM  One thing stands for another
The witches in Macbeth signifying evil




شێوەی ژمارە ٣٢ . نووسینی ئاسایی کوڕێکی ١٤ ساڵ نیشاندەدات. ئەو کلێشەی مێشکی خۆی دەربارەی تێبینییە ئینگلیزییەکان بەوێنە کێشاوە.

نموونەی سێیەم: وێنەیەکی عەقڵییە لەلایەن کچێکی فێرخوازی قۆناغی ناوەندییە، کە لە بیرکاریدا نمرەیەکی باڵای بەدەست هێناوە. کاتێک ئەم وێنەیە خرایە بەردەستی پرۆفیسۆرێکی بیرکاری، پرۆفیسۆرەکە گوتی ئەم وێنەیە لەلایەن خوێندکارێکی زۆر زیرەکی زانکۆوە کێشراوە و لانی کەم دوو ڕۆژی بردووە تا وێنەکەی کێشاوە، لە ڕاستیدا کچەکە تەنها بیست خولەکی خایاند. وێنەی عەقڵی ئەو توانایەی پێدا داهێنانێکی ناوازەی بۆ ئەو بابەتەکە وشک و ئاڵۆز و سەنگین و بێزارکەرەی هەبێت.

تەنانەت دەیتوانی زۆر باشتر بێت ئەگەر هەر هێڵێک لەخۆگری یەکەکانی وشە بوبایە نەک دەستەواژە، سوود وەرگرتنی ئەو لە فۆرم و شێوە بۆ بەرزکردنەوە و زیادکردنی وشەکان نیشانەی ئەگەری بوونی فرەییە لەم بونیادانەدا. لە بەشی دواتر ئەم ئایدە ڕووندەکەینەوە.

وێنەی عەقڵی بەشی شەشەم لە لایەن کچێکی ١٣ ساڵانەوە لە کالیفۆرنیا کێشراوە، کە هەروەکو ئیدوارد هیۆس وەکو خوێندکارێکی ئاسایی و ناوەند تەماشادەکرا، ئەم وێنە عەقڵییە زۆر بەسەرکەوتووی باس لە ناوەڕۆک و هەست و سۆز بۆ چیرۆکی کیوسا – هیباری دەکات و کورتی کردووەتەوە، نموونەیەکی زۆر نایابە بۆ شێوازی سوود وەرگرتن لە ڕەنگ، هێماکان، وێنە و شێوەکێشانی کورتکردنەوەی چیرۆکەکە.

لاپەڕەکەی دواتر بە بۆشی جێمان هێشتووە بۆئەوەی وێنەی عەقڵی بەشی حەوتی تێدا ئەنجام بدەیت.

لەم وێنە عەقڵییانەدا وشە یادهێنەرەوە گشتییەکان و وێنەی دەوروبەری شێوەیەکی ناوەندی سەرەکی پەیوەست کراون بەیەکەوە، ئەم بابەتانە ناوەڕۆکی گشتیی بەشەکانن و وێنەیەکی عەقڵی لە هەموو بونیادی فیکر دروست کراون.

**بۆ پێشەوە**

تیۆر و یاسایەکانی ئامادەکردنی ئەم وێنە عەقڵییانە بەشێوەیەکی گشتی لەم بەشەیەدا خراوەتەڕوو، سوود لە وێنەی عەقڵی بۆ هەر بەشێک وەکو پێشەکییەک بۆئەوەی کە دەخێتەڕوو وەربگرن، ئەمکارە خوێندنەوەی بەشەکان ئاسانتر دەکاتەوە. دوای تەواوبوونی بەشەکە جارێکی تر تەماشای وێنە عەقڵییەکە بکەنەوە. ئەمکارە پێداچونەوەیە بە بابەتەکاندا و یارمەتی ئێوە دەدات ئەو بابەتانەی کە دەیخوێننەوە لە یادتان بمێنێتەوە، ئەگەر دەتانەوێت زانیارییەکان بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ لە یادگەتاندا بمێنێتەوە ئەوا پێداچونەوەکەتان بەپێی خشتەیەکی کاتی دیاریکراوی پێداچونەوە ئەنجام بدەن.

# بەشی هەشتەم

# وێنە عەقڵییەکان - ڕێساکان و کارایی پێشکەوتوو

**پێداچوونەوە**

- وێنە عەقڵییە پێشکەوتووەکان
- وێنە عەقڵییەکان و توێژاڵی مۆغی چەپ و ڕاست
- سوود وەرگرتن لە وێنە عەقڵییەکان
- وێنە عەقڵییەکان بۆ قسەکردن
- وێنە عەقڵییەکان بۆ کۆڕ و سیمینارەکان
- وێنە عەقڵییەکان بۆ ڕاپۆرتەکان

ئەم بەشە باس لەوە دەکات چۆن توانا و داهێنان و ڕەهەندەکان بخەنە ناو وێنەی عەقڵتانەوە و چۆن دەتوانن سوودی لێ وەربگرن بۆ نوسینی وتار و ڕاپۆرت، تاقیکردنەوەکان، یاداشتکردن و نوسینی دەق و تێکستی گوفتاری.

## وێنە عەقڵییە پێشکەوتووەکان

ڕێکخستنی زانیارییەکانی هەموو بەشەکانی ڕابردوو و تێبینیکردنی ئەوەی کە مێشک باشتر سوود لە زانیارییەکان وەردەگرێت ئەو کاتەیە کە ئەوانە بەشێوەیەک ئامادەکرابێتن کە بە ئاسانی لە مێشکدا شوێنی خۆیان جێگیر و پتەو بکەن. هەروەها تێبینیکردنی زانیارییەکانی ئەم بەشە سەبارەت بە ماهییەتی چەندلایەنەی (فرەڕەهەندی) مێشک نیشانیدەدات ئەو یاداشتەکانی کە فۆڕمدار و داهێنەرانەترن توانای درککردنیان زیاترە و زۆر بەئاسانی دەچنە مێشکەوە.

ئامرازگەلێکی جیاواز بوونییان هەیە کە ئێمە دەتوانین سوودیان لێوەرگرین بۆئەوەی وەها یاداشتگەلێک بنوسین:



### ئاراستەکان (هێماکان)

ئەتوانین سوود لە هێماکان وەربگرین بۆئەوەی نیشانی بدەین کە چۆن ئەو واتا و مانایانەی کە لە بەشە جیاوازەکانی نمونەیەکدا جێگیربوون پەیوەست دەبن بەیەکەوە، دەتوانرێت ئەم هێمایانە یەک یان چەندین نوکییان پێوەبێت و ڕوو لە پێشەوە یان پاشەوە بکەن.



### ڕەمزەکان (نیشانەکان)

دەتوانرێت ڕەمز و نیشانەکانی وەکو ئەستێرە، نیشانەی پرسیار،

سەرسوڕمان، خاچ و زۆر نیشانەی تر لە تەنیشتی وشەکاندا بەکاربهێندرێن بۆئەوەی پەیوەندیی و ڕەهەندەکانی تر نیشانبدەن.

**شێوە ئەندازیارییەکان**



چوار گۆشە، لاکێشە، بازنە، سێ گۆشە و جۆرەکاتی تریش، دەتوانرێت بۆ نیشانەکردن بوارەکان و ئەو وشانە بەکاربهێندرێن کە ماهییەتێکی هاوشێوەیان هەیە، بۆ نموونە دەتوانین سوود لە سێ گۆشە وەربگرین بۆ نیشاندانی ڕێگا چارەیەکی گونجاو لە نموونەی چارەسەری کێشە، بۆ نموونە زۆرێک پێیان باشە هەمیشە سوود لە چوار گۆشە وەربگرن بۆ ناوەندی سەرەکی و لاکێشە بۆ ئەو ئایدانەی کە نزیکن لە ناوەندەوە و سێ گۆشەش بۆ ئەو ئایدانەی کە گرنگییەکی کەمترییان هەیە.

**سێ ڕەهەندی هونەری (سێ لایەنی هونەری)**



دەتوانین هەر یەک لە شێوە ئەندازیارییەکان کە ئاماژەمان بۆیکرد و زۆرێک لە شێوەکانی تریش بکەین بە سێ ڕەهەندی، بۆ نموونە چوار گۆشە بکەین بە خشتەکی (چوارپاڵوو - هەشتلا).

**وێنەی داهێنەرانە**



دەتـــوانین داهێنـــان بـــە ســـوود وەرگـــرتن لـــەو ڕەهەندانـــەی کـــە نموونـەی گونجـاو لەگـەڵ بابەتەکـەدا درووســـت دەکـــەن هاوتابکـــەین، بـــۆ نموونـــە کەســـێک کـــە دەیـــەوێت نموونەیـــەک بـــۆ فیزیـــای ئـــەتۆمی بکێشـێت و درووسـت بکـات، سـوود لـە نـاوکی ئـەتۆم و ئـەو ئەلیکترۆنانـــەی کـــە بەدەوریـــدا دەســـوڕێنەوە وەکـــو ناوەنـــدیی نموونەکەی وەرگرێت.

**ڕەنگ**

ڕەنگـــەکان وەکـــو ئـــامرازێکی یارمەتیـــدەر بـــۆ یادگـــە و داهێنـــان بەســـــوودن، دەتوانرێـــــت وەکـــــو هێمایەکان سوودیان لێوەربگیردرێت بۆئەوەی نیشانی بدەن چۆن ئەو واتا و مانایانە کە لە بەشە جیاوازەکانی نموونەکـــەدا هـــەن لەگـــەڵ یەکـــدا پەیوەســتدەبن، هــەروەها ئەوانــە بــۆ نیشاندانانی ناوەندەکانی دەوروبەری سەرەکی نموونەکە سوودیان لێوەردەگیردرێت.



**وێنە عەقڵییەکان و توێژاڵی مۆغی چەپ و ڕاست**

لەم بوارەدا باشتر وایە سەرنجی ئەو بابەتە بدەین کە چۆن توێژینەوەکانی ئەم دوایانە سەبارەت بە مێشک دەبێتە هۆی بەهێزکردن و پتەکردنی زانیارییەکانی پێشووترمان، بەهەمانشێوەی کە پێشتر ئاماژەمان بۆی کرد بە گەڕانەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە ئەگەر زانیارییەکان بەشێوەیەک ئامادەبکرێن کە بە ئاسانی لە مێشکدا جێگەی خۆیان بگرن، زیاتر و باشتر دەتوانین سوودیان لێوەربگرین. سەرنجی توێژینەوەکانی ڕاجر اسپیری، ڕۆبێرت ئۆرنیستن و ئیران زایدل سەبارەت بە کاکڵە و چینی مۆخی ڕاست و چەپ بدەن.

ئەم توێژینەوەیە دەمان گەیەنێت بەو ئەنجامگیرییەی کە یاداشتکردن و تەکنیکی ڕێکخستنی فیکر کە بۆ بەجێهێنانی پێویستییە گشتییەکانی مێشک سازکراون تەنها لەخۆگری وشەکان، ژمارەکان، بەردەوامی، تاکرەهەندی بوون نییە، بەڵکو ڕەنگ، ڕەهەند و لایەن، ڕیتمی بینین، ئاگایی سەبارەت بە مەودا و چەندانی تریش لەخۆ دەگرێت، بەواتایەکی تر وێنە عەقڵییەکان لەخۆدەگرێت.

لە هەر ڕویەکەوە تەماشای ئەو بابەتە بکەین کە ئایا لە دیدگای ماهییەتی وشەکان و زانیارییەکانیان، پرۆسەی یادهێنانەوەی زانیارییەکان، مۆدێلەکانی وێنەی عەقڵی و یان تەنانەت توێژینەوەکانی کۆتایی سەبارەت بە مێشکی مرۆڤ گرنگی هەیە یان نا، لە کۆتاییدا دەگەین بەو وەڵامە هاوبەشەی کە هەموان دەیانەوێت لە توانا باڵاکانی مێشکیان بەهرەمەندبن، ئێمە لە سەرەتاوە دەبێت بەشێوەیەکی جیا و بەش بەش هەر یەک لەو

بوارانە بخەینەبەر باس و لە کۆتاییدا پێناسەیەکی هاوشێوە بخەینەڕوو.

**سوود وەرگرتن لە وێنە عەقڵییەکان**

ماهییەتی وێنەی عەقڵی بەتەواوەتی پەیوەستە بە کارایی مێشکەوە و ئەوان دەتوانن لەهەر چالاکییەکی وەکو بیرکردنەوە، یادهێنانەوە، بەرنامەڕێژ و داهێناندا، بەکاربهێندرێن. هەشتەمین لاپەڕەی ڕەنگکراوی وێنەی عەقڵی کە سەبارەت بە کارایی وێنە عەقڵییەکانە کە پانتاییەکی فراوانی کارایییەکان نیشاندەدات، لە درێژەی ئەم بەشەیەدا کارایی ئەم وێنانە لە نوسینی ڕاپۆرت، تێکستی گوفتاری، تاقیکردنەوەی جۆری کار لە کۆبوونەوە و پەیوەندییەکان و یاداشتکردنەکان ڕووندەکەینەوە.

**وێنە عەقڵییەکان بۆ قسەکردن**

ئامۆژگارییتان دەکەم کاتێک خەریکی یاداشتکردنن سوود لە لاپەڕەیەکی گەورە و A٣ وەرگرن، بەم کارەتان وادەکات مێشکتان شێوەیەکی گشتی لەو زانیارییانە هەبێت کە مێشک خەریکی تاوتوێکردنێتی.

لە کاتی یاداشتکردنەکەتان بە تایبەتی لە گوفتار و قسەکردندا زۆر گرنگە ئەوەتان لە یادبێت کە وشەکان و دیمەنە کلیلییەکان هەموو ئەو شتانەیە کە ئێوە پێویستانن، هەروەها ئەوەش گرنگە لە یادتان بێت کە بونیادی دەرئەنجامەکان تا کۆتایی ڕووننابێتەوە. کەواتە هەر یاداشتێک نیمچە دەرەنجامە نەک کۆپی کۆتایی. وشەکانی سەرەتای یاداشتەکان لەسەرەتاوە ڕەنگە بێمانا دیاربن تا ئەوکاتەی ناوەڕۆکی گوفتارەکە ڕووندەبێتەوە، پێویستە بەڕوونی

بەهای ئەو یاداشتانەی کە نارێکخراون لەبەرامبەر ئەو یاداشتانەی کە ڕێکخراو و مانادارن درکبکرێن و لێیات تێبگەن، زۆرێک لە خەڵکی کاتێک لاپەڕەیەک دەبینن کە پڕە لە نوسینی ناخۆش و پڕن لە هێما و نیشانەی ئاڵۆز و نارێک و پێک هەست بە نیگەرانی دەکەن، بەشێوەیەکی نەریتی یاداشتە ڕێک و پێکەکان ئەوانەن کە بە ڕێسایەکی هێڵدار و سیستماتیک ڕێکخراون، یاداشتە نارێک و پێکەکان ئەوانەن کەبەشێوەیەکی ناسیستماتیک لە تەواوی لاپەڕەکەدا پەرتەوازە بوون، ئەو وشەە نارێک و پێکانەی کە لەم بەشەدا بەکاردەهێندرێت ئاماژە بە ڕووکەش دەکات نەک ناوەڕۆک.

لە یاداشتکردندا لە سەرەتادا ناوەڕۆکی بابەتەکان گرنگن نەک ڕوکەش و فۆرم. ئەو یاداشتانەی کە وادەردەکەوێت ڕێکوپێکن لە ڕووی چەمک و زانیارییەوە نارێکخراون، بەهەمانشێوەی کە لە کۆتایی بەشی شەشەمدا ئاماژەمان بۆکرد. زانیارییە گشتییەکان لە گۆڕاندان و بێ مانا و تێکئاڵاون کە لەخۆگری زۆرێک لەو وشانەیە کە لە ڕووی زانیارییەوە پەیوەندییان بەیەکەوە نییە و بێمانان. ئەو یاداشتانەی کە لە وێنەی عەقڵییەوە دەردەچن لە کۆتاییدا پەیوست دەبن بەیەکەوە و بە زەحمەت دە خولەک درێژە دەکێشێت بۆئەوەی یاداشتێکی یەک کاتژمێری لەسەر کاغەزێک تەواوبکەین. بوونی وێنەی عەقڵی کۆتایی، ڕاهێنانێکی بەرهەمهێنەرە بەتایبەتی ئەگەر خولی فێربوون بەشێوەیەکی گونجاو ڕێکخرابێت و ئەم وێنەیە بەشێوەیەکی سەرکەوتوو کاردەکات.

**وێنە عەقڵییەکان بۆ کۆڕ و سیمینارەکان**

کۆڕ و سیمینارەکان بەتایبەتی ئەو کۆڕ و سیمینارانەی تایبەتن بە بەرنامەداڕێژی یان چارەسەری کێشەکان، بەزۆری بەهۆی

تەرکیزی تاکەکە لەسەر قسەکردنی ئەوانی تر ئەویش بەو هۆیەی کە خەڵکی گوێ لە وتارەکە دەگرن تەنها لەبەرئەوەی لەگەڵ تەواوبوونی وتارەکەیدا بابەتەکەی خۆی بخاتەڕوو. لە کۆڕ و سیمینارەکاندا زۆرێک لە بابەتە گرنگەکان پشتگوێ دەخرێت و لەبیردەکرێن و کاتێکی زۆریشی تێدا بەهەدەر دەدرێت. خاڵێکی تر هەیە کە دەبێت ئاماژەی بۆ بکەین و جێگەی نیگەرانی زۆربەی ئەو کەسانەیە کە کۆڕ و سیمینار دەکەن ئەوەیە ئەو بابەتانەی کە گرنگ و بەبایەخن مەرج نییە گوێگران وەریبگرن یان ئەو بابەتانەی کە خەڵکی وەریدەگرن و بەلایانەوە پەسەندە ڕەنگە ئەو کەسەی کە کۆڕەکە سازدەکات بەلایەوە گرنگییەکی ئەوتۆی نەبێت، بەڵکو زیاتر ئەوانەن کە گوتاربێژەکە دەنگ بەرز دەکاتەوە و سەرنجی گوێگران بۆلای خۆی ڕادەکێشێت و باشتر دەریدەبڕێت.

ئەگەر گوتاربێژەکە سوود لە بونیادی وێنەی عەقڵی وەربگرێت دەتوانێت بەسەر زۆربەی کێشەکانیدا زاڵبێت کە لە کاتی پێشکەشکردنی کۆڕ و سیمینارەکاندا ڕووبەڕووی دەبێتەوە، لە کۆڕ و سیمینار و وتارداندا دەبێت ئەو بابەتە سەرەکییەی کە قسەی لەبارەوە دەکەن پێناسە بکەن و چەند چەمکێکی گرنگ و سەرەباسەکان بەشێوەی وێنەی عەقڵی بەیان بکەن. زۆر گرنگە دەبێت ئامادەبوان لە پێشدا ئاگاداربکرێنەوە و بزانن بابەتی سەرەکی کۆڕەکە چییە و باس لە چی دەکات و بەباشی خۆی بۆ ئامادەکردبێت، کاتێک هەر ئامادەبوویەک بییەوێت بابەتەکەی خۆی بخاتەڕوو دەبێت داوایلێبکرێت شێوەیەکی کلیلی لە بابەتەکەی کورت بکاتەوە و نیشانی بدات بەبۆچوونی خۆی ئەو بابەتەی کە خراوەتەڕوو لە کوێدا دەبێت لە وێنەی عەقڵیدا بنوسرێت.

لە خوارەوە سوودەکانی ئەم ڕێسایە دەخەینەڕوو:

١ – هەموو کەسێک دەتوانێت بابەتەکانی بەشێوەیەکی درووست و ڕاست بنوسێت و یاداشت بکات.
٢ – هیچ زانیارییەک لەناو ناچێت.
٣ – زیاتر گرنگی بەو ئایدە گرنگانە دەدرێت کە دەخێتە ڕوو، نەک ئەوەی چی کەسێک وتوویەتی.
٤ – زیاتر ئامادەبووان سەبارەت بە بابەتەکە قسەدەکەن و کەمتر لە بابەتی سەرەکی لادەدەن و کەمتر دەنگەدەنگ دەکەن.
٥ – دوای تەواوبوونی کۆڕ و سیمینارەکە هەموو ئامادەبوان وێنەیەکی عەقڵییان لەسەر بابەتی کۆڕەکە هەیە و ئەکاتیش بەدڵنیاییەوە زیاتر لە شەو و ڕۆژێک بە باشی بابەتە گرنگەکانی کۆڕەکەیان بیردێتەوە و دەتوانن سوودی لێوەربگرن.

سوودێکی تری وێنەی عەقڵی بەتایبەتی لە یاداشتکردن و درووستکردنی پەیوەندیدا ئەوەیە کە تاکەکان بە بەردەوامی و چالاکانە سەرقاڵن بە بونیادنانێکی گشتی ئەوەی کە ڕوودەدات، لەبری ئەوەی بیریان لای کات و تەواوبوونی کۆڕەکە بێت، بەشدارییەکی سەرکەوتووانە دەبێتە هۆی ئامادەگیی ڕەخنە و لێکدانەوە، هەڵسەنگاندن، شیکردنەوە، و هەروەها توانایی لە یادهێنانەوە و کۆنترۆڵکردن و تێگەیشتنێکی گشتی زۆر بەرز بۆ بابەتەکان.

## وێنە عەقڵییەکان بۆ ڕاپۆرتەکان

کاتێک کە وێنەی عەقڵی کامڵ و تەواو دەبێت، زانیارییە داواکراوەکان بە ئاسانی دێنەیاد، خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە بڕیار بدەین لە کۆتاییدا بەچی شێوەیەک بیانخەینەڕوو. وێنەیەکی عەقڵی سەرکەوتوو ڕێگەچارە و ئەگەرگەلێکی زۆر بۆ ئێوە فەراهەم

دەکات. کاتێک هەڵبژاردنێک دێتە ئاراوە هەر زەمینەیەک لە وێنەی عەقڵی دەتوانێت بە ڕەنگێکی جیاواز دەوربدرێت و بە ڕێکخستنێکی گونجاو ژمارە و هێمای بۆ دابنرێت. خستنەڕووی ئەم بابەتە بەشێوەی نوسینەکی یان گوفتاری تەنها بابەت بەرنامەداڕێژی و پلانە بۆ بابەتە سەرەکییەکان کە دەبێت کۆنترۆڵبکرێت و خاڵ بە خاڵ تاوتوێبکرێت. بەهۆی وێنەی عەقڵییەوە گرفتەکانی وەکو دووبارە کردنەوە و جیاکردنەوەی بابەتی گرنگ لە بابەتی ناگرنگ و تێکەڵ و پێکەڵکردن ڕوونادات، چونکە هەموو بابەتەکە بەشێوەیەکی ڕێکخراو و کامڵ لە وێنەی عەقڵیتاندا خۆی نمایش دەکات.

سوود وەرگرتن لەم تەکنیکە لە زانکۆی کامبریج بەهۆی ئەوەی ئیدوارد هیوس چیرۆکە بەناوبانگەکەی تەواوبکات، هەروەها ئەم تەکینیکانە یارمەتی منیدا تا بتوانم کتێبی توانای مێشک بنوسم!

**بۆ پێشەوە**

وێنە عەقڵییەکان، وێنەیەکی دەرەکییە لە پەیوەندییەکی ئاڵۆزی ناوەوەی مێشکتان، ئەوتوانایە ئەدەن بە مێشک بۆئەوەی بەشێوەیەکی ڕوون خۆمان ببینین و پانتاییەکی کامڵی چالاکی مێشکتان بەرزدەکاتەوە. ئەوانە توانایی، چێژ، وردبینی، شادییەکی بەردەوام دەبەخشن بە ژیانتان.

# بەشی نۆهەم

# وێنەی عەقڵ (تەکنیکی خوێندنەوەی سیستماتیکی)

## پێداچوونەوە

- فێرخوازێکی بێمەیل
- کتێب وەکو ڕێگا چارەیەک
- تەکنیکە کۆن و نوێیەکانی خوێندنەوە
- وێنەی عەقڵی (تەکنیکی خوێندنەوەیەکی سیستماتیک و ڕێکخراو)
- ئامادەیی وێنەی عەقڵی ڕێکخراو
- ئەرکی وێنە عەقڵییە ڕێکخراوەییەکان
- کورتە : تەکنیک

زۆربەی خەڵکی کێشە و گرفتییان هەیە لە خوێندنەوە و پێداچوونەوەی بابەتەکان، لەم بەشەدا تەکنیکێکی نوێتان فێردەکرێت کە ئەوتوانایەتان پێدەبەخشێت هەر بابەتێک کە دەتانەوێت بەباشی بیخوێننەوە و لێیتێبگەن!

## فێرخوازێکی بێمەیل

کاتژمێر، شەش، ئێوارە، فێرخواز، موشتاق، ماندونەناس، بە هیوایەکی باشەوە، تا درەنگانی شەو کەسێکە کە ڕەنگە پێشتر ناسیبێتتان، کاتژمێر شەشی بەیانی بەرەولای مێزی خوێندنەکەی ڕۆشت و هەموو پێداویستییەکانی خوێندنەوەکەی ئامادەکرد، دواتر بە وردی هەموو وانەکەی دووبارەکردەوە، ئەمکارە یارمەتیدا واز لە بیانوی نەخوێندن بهێنێت، ئەوە دێتەوە یادی ئەمڕۆ کاتی تەواو نەبووە بۆ خوێندنەوەی هەموو بابەتە گرنگ و سەرنجڕاکێشەکانی ڕۆژنامە.

هەروەها تێدەگات ئەگەر دەیەوێت بخوێنێتەوە دەبێت هەموو بابەتە بچوکەکانیش بەشێوەیەکی تەواوەتی لەبەرچاوبگرێت پێش ئەوەی سەرقاڵی ئیش و کاری ڕۆژانەی بێت.

بۆیە مێزەکەی جێدەهێڵێت و نیگایەکی خێرا و سەرپێی بە ڕۆژنامەکان دەکات و لەکاتی هەڵدانەوەی پەڕەکاندا سەرنجدەدات ئەو بابەتەگرنگانەی کە چاوەڕێی دەکرد لە ڕۆژنامەکاندا هەبێت زۆر زیاترە لەوەی کە چاوەڕوانی لێدەکرد، ئەو هەروەها لە کاتی هەڵدانەوەی پەڕەی ڕۆژنامەکان گەشت بە بابەتە سەرگەرمییەکانی ڕۆژنامەکەیدا. ئەمە بیرۆکەیەکی باشە کە بۆ یەکهەمین کاتی پشوودانی لە ئێوارەدا بەرنامەدابنێت، ڕەنگە پلانێکی باشی نیوکاتژمێری لە نێوان ٨ بۆ ٨,٣٠ خولەکی باش بێت بۆی.

ئەو دەستی کرد بە بەرنامەدانان، کاتی دەستپێکردنی ڕێک ٧ ی پاش نیوەڕۆ بوو، لەم ساتەدا بیردەکاتەوە و بەخۆی دەڵێت، باشە، ڕۆژێکی سەختم بردەسەر، کاتێکی زۆر نەماوە بۆ دەستپێکردنی کاتی بەرنامەکە، بەهەرحاڵ من پێویستم بە پشوودانە و ئارامی و پشوودان یارمەتی من دەدات بۆئەوەی بەگوڕ و تینترەوە خۆم

ئامادەبکەم بۆ خوێندنەوە. کاتژمێر ٧:٤٥ خولەکی دوای نیوەڕۆ دڕوات بۆ سەر مێزی خوێندنەوەکەی، چونکە دەستپێکردنی بەرنامەکەی قەشەنگتر بوو لەوەی کە خۆی وێنای بۆی دەکرد.

لەم کاتەدا کە ئەو هێشتا کتێبەکەی بەدەستەوەیە و تەماشای دەکات، لەناکاو بیردەکاتەوە تەلەفۆن بۆ هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویستی بکات کە بەباوەڕی ئەو ئەم پەیوەندییە دەبێتەهۆی ئەوەی وزە و توانایەکی باشتری پێبدات بۆ خوێندنەوەکەی. تەلەفۆنەکە زۆر گەرم و گوڕتر و زیاتری خایاند لەوەی کە ئەو پێشبینی دەکرد، سەرەنجام ئەم فێرخوازە بەجۆش و خرۆشە دیقەتیدا کاتژمێر نزیکی ٨:٣٠ خولەکە و ئەو هێشتا لەسەر مێزی خوێندنەوەکەیەتی.

ئەمجارەیان بە ڕاستی لەسەر مێزی خوێندنەکەی دادەنیشێت و کتێبەکەی دەکاتەوە ئەم کارەی ئەو نیشانی دەدات کە ئەو بەتەواوەتی بڕیاری داوە ئەمجارەیان زۆر بەجدی بخوێنێتەوە، بەڵام پاش ئەوەی لەدەستی برسێتی و قۆڕەقۆڕی ناوسکی قوتای بێت دەست دەکات بە خوێندنەوە (هەڵبەت لە هێشتا لاپەڕەی یەکدایە)، ئەمە کارێکی زۆر بێمانایە کە تۆ برسیت بێت و لەژێر فشاری دەرونی و برسێتیدا بیت بتەوێت بخوێنیتەوە، بەم شێوەیە تۆ هەستێکی ناخۆشت لا دروستدەبێت و کەمتر دەتوانیت تەرکیزت لەسەر خوێندنەوەکەت هەبێت، بۆیە بەتەنها باشترین ڕێگاچارە ئامادەکردن و خواردنی نانێکی سووکە، ئەم خواردنە بەچێژە مێشکت دەکاتەوە و خواردنی سووک وزە و چالاکییەکی زۆرت پێدەبەخشێت.

بە چارەسەرکردنی برسێتی و خواردنێکی بەتام و چێژ ئیتر هیچ ڕێگرییەک نابینم لەبەر خوێندنەوەکەمدا. بۆیە دووبارە تەماشای

یەکەمین وشەکانی سەرەتای لاپەڕەی یەکەم دەکاتەوە .... و لەمکاتەدا هەست بە تێری و قورس بوونی مەعیدەی دەکات و لەگەڵیشدا خەو زۆری بۆدێنێت. باشترین کار لێرەدا تەماشاکردنی بەرنامەیەکی نیوکاتژمێرییە لە ١٠ ی شەودا و بەمەش بەتەواوەتی خەوەکەی دەزڕێت و دەتوانێت بەردەوامی بدات بە خوێندنەوەکەی. بەڵام کاتژمێر ١٢ ی شەوە و دەیبینین لەبەردەم تەلەفزیۆنەکەدا خەویَ لێکەوتووە.

تەنانەت لە وەها دۆخێکیشدا کاتێک کەسێک خۆی دەکات بە ژوورەکەیدا و بێداردەبێتەوە واهەست دەکات شتێکی ئەوتۆ ڕووینەداوە و پشوویەکی باشی کردووە و خواردنێکی چاکی خواردووە و بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی خۆشی بینییوە و لەگەڵ هاوڕێ خۆشەویستەکەیدا قسەی کردووە، زانیاری پێویستی تایبەت بەورۆژەی خوێندووەتەوە و هەموو شتێکی بەباشی ئەنجامداوە، بەشێوەیەک کە زۆر بەباشی ئامادەیە بەیانی کاتژمێر شەش هەمان کار دووبارە بکاتەوە.

## کتێب وەکو ڕێگا چارەیەك

ئەوەی لەسەرەوە باسمانکرد پێکەنیناویی دیارە، بەڵام لە ڕاستیدا شتێکی گرنگ و جدییە و جێگای هەڵوێستە لەسەرکردنە.

لە لایەکەوە ڕوداوەکە دڵگەرمییەکی زۆری پێوە دیارە چونکە ئەوە ڕاستییەکە زۆربەمانی لیَ بەدەر نین و ئەو کێشەیە دووچاری هەمووومان بووەتەوە، بابەتێک دەسەلمێنێت کە ساڵانێکە جێگەی باسە و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت: واتا هەموو کەسێک داهێنەر و بەتوانا و زرنگن ئەوەی کە هەندێک کەس هەست دەکات هیچ بەهرە و هونەرێکی تێدانییە، گرنگ نییە. ئەو ڕۆحە داهێنەرانەیەی

که له نموونەی فێرخوازێکی بێمەیلدا باسمانلێوەکرد، بەچاکی سوودی لێوەرنەگرت. بەڵام ئەو پڕوبیانویانەی که ئێمە بۆ ئەنجامنەدانی کارێک بۆخۆمان دەیهێنینەوە نیشانی دەدات هەموو کەسێک گەنجینەیەکی گەورەی بەهرە و توانای هەیە که دەتوانێت له لایەکی ترەوە سوودی لێوەربگرێت و بەکاریبهێنێت!

ئەم چیرۆکە له لایەکی تریشەوە جێگای نائومێدییە چونکە ترسێکی بەربڵاو و شاراوە نیشاندەدات که زۆربەمان کاتێک دەمانەوێت دەقێک بخوێنینەوە بەسەرماندا دێت.

ئەم ترس و بێمەیلییە له سیستەمەکانی فێربوونی وانەکانی تاقیکردنەوەدا سەرچاوە دەگرێت، لەم جۆرە سیستەمانەدا فێرخواز بە کۆمەڵێک وانە ئاشنا دەکرێت که له قوتابخانە فێرکراوە، ئەو دەزانێت کتێبی قوتابخانەکان و پڕۆگرامەکان سەختر و ناخۆشترن له کتێبی ڕۆمان و چیرۆک و کتێبە سەرگەرمییەکان، لەگەڵ ئەوەشدا سەرنجی لەوەیە که دەبێت زیاتر خۆی ماندووبکات و ئەو زانیارییانەی که لەم پڕۆگرامانەدا هەن تاقیکردنەوەی تێدا ئەنجامبدات.

ئەم ڕاستییە که کتێبە پڕۆگرامییەکان دژوار و بێزارکەرن خۆی بۆخۆی مایەی نیگەرانییە، ئەم ڕاستییە که کتێبە پڕۆگرامییەکان کاتێکی زۆری پێویستە مایەی نیگەرانییە. چونکە فێرخوازەکە هەست دەکات ناتوانێت زۆربەباشی بخوێنێت و بنوسێت و بیهێنێتەوە یاد. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا فێرخوازەکە که بیردەکاتەوە دەیانەوێت تاقیکردنەوەی لەسەر بکەن له هەمووی گرفتترە. ئێمە دەزانین ئەم جۆرە بیرکردنەوانە دەبێتە هۆی لاوازبوونی توانا عەقڵییەکانمان، ژمارەی ئەو کەسانەی که بەتەواوەتی هەموو پڕۆگرامەکەیان خوێندوە و کۆنترۆڵیانکردووە

بەڵام لە هۆڵی تاقیکردنەوەکان ناتوانن وشەیەکیش بنوسن و هەروەها ژمارەی ئەو کەسانەی کە دەتوانن تا ئاستێک وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە بەڵام فشاری دەروونی و ڕێگری عەقڵیی گەورەیان هەیە تادەگاتە ئەو ئاستەی کە کەمترین شتیان لە تاقیکردنەوەکەدا بیردەمێنێتەوە، زۆر زۆرن.



شێوەی ژمارە ٣٣ . لەم کاتەدا زیاتر گرنگی دراوە بە زانیارییەکان نەک فێرخوازەکە و زیاتر جەخت لەسەر زانیارییەکان کراوەتەوە. لێرەدا ئەو نغرۆی شەپۆلی زانیارییەکان بووە و خەریکە لەپێ دەکەوێت، ئەم کەڵەکەبوونی زانیارییانە فشارێکی دەروونی لەسەر تاکەکە دروست کردووە، لێرەدا توانای تاکەکە بۆ کۆنترۆڵ و زاڵبوون بەسەر زانیارییەکاندا لەبەرچاو نەگیراوە، ئەگەر قەرار وابێ ئەم قوتابییە زاڵبێت بەسەر ئەم ڕاستییە دژوارەدا ئەوا دەبێت بەدوای ڕێسا و تەکنیکێکی نوێدا بگەڕێت بۆ سوود وەرگرتن لە توانا عەقڵییەکانی بۆ فێربوون، بیرکردنەوە، داهێنان، یادهێنانەوە و چارەسەری گرفتەکان. تەماشای وێنەی ٣٧ بکەن.

تەنانەت لەو خراپتر هەندێک لە خوێندکارەکان لەکاتی وەڵامدانەوەی پرسیارەکاندا زۆر بەچڕی خەریکی نوسینن و بۆماوەی دوو کاتژمێر سەریان لەسەر لاپەڕەکە لانابەن، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان زیاد لە چەند جارێک وشە و دەستەواژەکان دووبارە و دووبارە دەکەنەوە و تێکەڵ و پێکەڵییەکی زۆریان پێوە دیارە.

منداڵ و ساوایانیش بە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم جۆرە مەترسییانە کە لە ڕاستیدا بۆ هەندێکییان زۆر ترسناکە و یەکێک لەم دوو هەڵبژاردەیەیان لەبەردەستدایە: یان دەتوانێت بخوێنێت و لەگەڵ کۆمەڵێک ئاکامی نەخوازراودا ڕووبەڕووبێتەوە، یان نەخوێنێت و لەگەڵ کۆمەڵێکی تر لە ئاکامە نەخوازراوەکاندا ڕووبەڕوو بێتەوە. ئەگەر بخێنێتەوە و ئاکامێکی خراپی هەبێت ئەوکاتە خۆی وەکو کەسێکی لاواز، بێتوانا، نەخوێندەوار، بێبەهرە و گەمژە دەبینێت، هەڵبەت بابەتی سەرەکی ئەوە نییە بەڵکو بابەتی سەرەکی ئەوەیە کە ئەو نازانێت کە ئەم شێوازی خوێندنەوەیە نادرووست بووە بۆیە ئەم ئاکامانەی لێ دەکەوێتەوە، نەک لاوازی و بێدەسەڵاتی خۆی.

ئەگەر نەخوێنێت ئەوا بارودۆخەکە بەتەواوەتی جیاوازە، ئەگەر شکست بێنێت لە تاقیکردنەوەیەکدا یەکسەر دەڵێت بۆیە شکستم هێناوە چونکە وانەکەمم نەخوێندە و حەزیشم لە خوێندنی نەبوو و زۆر بێزاری دەکردم.

بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو کێشەیەیدا بەچەند کردارێک خۆی دەرباز دەکات:

١ – ڕێگە نادات ئەم تاقیکردنەوە و هەڕەشەیە زیان بگەیەنێتە سەر باوەڕبەخۆبوونەکانی، شانازی بە شکستەکەیەوە دەکات.

٢ – بیانوویەکی زۆر چاکی بۆئەم شکستە لەبەردەستدایە.

٣ – ئەبێتە هۆی پیاهەڵدان و ستایشی لەلایەن فێرخوازەکانی ترەوە چونکە ئەو توانای ڕووبەڕووبوونەوەی گرفتێکی واگەورەی هەیە، ئەوەش بڵێین زۆربەی کات ئەمجۆرە فێرخوازانە کۆنترۆڵی پۆل دەگرنە دەست و دەبن بە نوێنەر و دەمڕاستی پۆلەکە.

ئەو خاڵەش بخەینەڕوو تەنانەت ئەو قوتابیانەش کە بەردەوام دەخوێنن و خۆیان ماندوو دەکەن هەمیشە کاتێکی بچوک بۆخۆیان دەهێڵنەوە کە واخۆیان نیشان بدەن ئەمانیش ناخوێنن و ناترسن لە تاقیکردنەوەکان و وانەکە بەلایانەوە فشەیە. زۆرجاریش ئەو خوێندکارانەی کە نمرەی ٨٠ بۆ ٩٠ یان هێناوە هەوڵدەدەن ئەمانیش وەکو ئەو خوێندکارانەی کە ناخوێنن و بیانوو بۆ نەخوێندنەکەیان دێننەوە بیانبوو بێننەوە کە بۆچی ئەوان ١٠٠یان نەهێناوە.




شێوەی ژمارە ٣٤. تێڕوانینێکی نەریتییە بۆ زانیارییەکان لەبواری زانستە جیاوازەکاندا کە ئاراستەی قوتابی کراوە و کەڵەکە بوە لەسەری، شەپۆلی ئاراستە و ڕەوتەکە لە بابەتەکەوە بەرەو قوتابییەکەیە، لێرەدا تەنها زانیاری پێشکەشی قوتابییەکە دەکرێت داوای لێدەکرێت هەموو زانیارییەکان وەربگرێت و جێگیری بکات و فێربێت و تا ئەندازەیەکی زۆریش بتوانێت لەکاتی پێویستدا بیانهێنێتەوە یاد. شێوەکەی سەرەتای ئەم بەشە تەماشابکەنەوە.

### تەکنیکە کۆن و نوێیەکانی خوێندنەوە

ئەوەی کە لە سەرەوە خستمانەڕوو بۆ زۆربەی فێرخوازان جێگای ڕەزامەندی نییە، لە سەرەتای ئەم کتێبەدا زۆرێک لە هۆکارەکانیمان خستەڕوو، یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی بەدەستهێنانی نمرەی لاواز و شکست لە خوێندنەوە هەڵبژاردنی ئەو ڕێسا و تەکنیکانەیە کە قوتابی پێڕەوی دەکات.

ئەو فێرخوازە لەناو قەبارەیەکی زۆر گەورە و ئاڵۆزی بابەت و بواری جیاوازدا چواردەور دراوە و دەیان بەشە زانستی جیاواز کەڵەکە بوەتەسەری، چاوەڕوانیش دەکەین هەموویان فێرببێت و کۆنترۆڵی بکات و بتوانێت بەباشترین شێوە بیهیانهێنێتەوە یاد، لە کۆمەڵێک وانەی ناخۆشی وەکو کیمیا، فیزیا، بیرکاری، ئەستێرەناسی، ئایین، فەلسەفە، جوگرافی، مێژوو، ئینگلیزی، زمان، لۆجیک، بیرکاری، کۆمەڵناسی، زیندەوەرناسی، ڕوەکناسی، زەویناسی، ... تێبگات و درکیان بکات. لە هەریەکێک لەم بابەتانەدا فێرخوازەکە لەگەڵ کۆمەڵێک ساڵ و مێژوو، ناوی بیریارانی، گریمانە، تیۆریا و قوتابخانە، ڕووداو، لق و پێناسەی گشتیدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە و بەردەوامیش ڕوودەداتەوە. (دوو شێوەکەی سەرەوە و ئەوەی خوارەوە تەماشا بکەنەوە)، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئێمەی فێرخواز ڕێگایەکی نادروستمان بۆ خوێندنەوە و کۆنترۆڵکردنی وانەکانمان گرتووەتەبەر و نازانین چۆن پەیوەندی

درووستبکەین لە نێوان زانیارییەکاندا (دووبارە دوو شێوەکەی سەرەوە و خوارەوە تەماشا بکەنەوە).

بەهەمانشێوەی کە لە شێوەکانی سەرەوەدا دەبینرێت ئێمەی فێرخواز زیاد لە ئاستی توانای پێویست زانیارییەکانمان لەسەر خۆمان کەڵەکە کردووە، هەروەها لە کاتی تاقیکردنەوەکاندا دووچاری سەرلێشێوان و فشاری دەروونی زۆر دەبینەوە. ئەم ڕێسایانە تەنانەت لە خوێندنگا و زانکۆ و پەیمانگا و دامەزراوەکانی تایبەت بە یارمەتیدانی خوێندندا پشتگیری لێدەکرێت و ئامۆژگاری فێرخوازان دەکرێت پێڕەوی لێبکەن، ئەم تەکنیکانە ڕێساگەلێکی تۆڕئاسان (شەبەکە) کە یاسا گەلێکی هاوشێوە بۆ خوێندنەوەی بابەتە جیاوازەکان دەخەنەڕوو، زۆرجار ئامۆژگاری قوتابییان دەکرێت چەندجارێک کتێبەکە دووبارە بکەنەوە بۆئەوەی کۆنتڕۆڵی بکەن، بەڵام دەبێت ئەوە بزانین بەوەها ڕێسایەک مامەڵە لەگەڵ هەموو کتێب و بابەتێکدا بکەین، جیاوازییەکی زۆر لە نێوان خوێندنی دەقێکی ئەدەبی لەگەڵ بابەتێکی بیرکاریدا هەیە بۆیە بۆ خوێندنەوەیەکی درووست پێویستمان بە ڕێسایەکە کە جیاوازی لە نێوان بابەت و وانە جیاوازەکاندا بکات و تەکنیکێکی تایبەت ئیجبار نەکات بەسەر هەموویاندا.




شێوەی ژمارە ٣٥ . لە تەکنیکە نوێیەکانی فێرکردندا پێچەوانەی تەکنیکی کۆن، لێرەدا زیاتر جەختکراوەتەسەر قوتابی. لەبری ئەوەی بابەتەکان ئاراستەی قوتابی بکرێت، لە سەرەتاوە تواناکانی فێرخواز دەردەخرێت سەبارەت بەوەی کە چۆن دەتوانێت بیربکاتەوە، فێرببێت، هەڵسەنگاندن بکات، بهێنێتەوە یاد، شیکاربکات، داهێنان بکات، ڕێگاچارە بدۆزێتەوە و پاشان ئەو توانایانە بەکاردەهێنێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بابەتەکان.

لە سەرەتاوە دەبێت لە تواناکانی قوتابییەکەوە دەستپێبکەین، نەک ئەوەی بە کتێب و وانەی ئاڵۆز و جیاواز جیاواز دەستکەین بە بۆمبارانکردنی، دەبێت تەرکیز بخەینەسەر ئەو بابەتەی کە

فێرخوازەکە چۆن دەتوانێت خوێندنەوەیەکی سەرکەوتوتری هەبێت. دەبێت ئەوە فێری خۆمان بکەین لە کاتی خوێندنەوەدا چاوەکانمان چۆن ببینن، چۆن زانیارییەکان بهێنینەوە یاد، چۆن بیربکەینەوە، چۆن بتوانین بەشێوەیەکی باش فێرببین، چۆن بتوانین نوسینەکانمان بەباشترین شێوە دابڕێژین، چۆن بتوانین چارەسەری ئەو گرفتانە بکەین کە دێنە ڕێمان، بەشێوەیەکی گشتی چۆن بتوانین بە باشترین شێوە سوود لە توانا عەقڵییەکانمان وەرگرین بۆ هەر بابەتێک.

**توانای عەقڵ**

ئەوخاڵەش بخەینەڕوو لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا بەزۆری لە هەر بوارێکدا تەنانەت بۆ ئاسانترین ئامێرە تەکنەلەجۆی و ئەلکترۆنییەکان کتێبی ڕێنمای لەگەڵدایە کە دەڵێت چۆن ئەنجامی بدەین و بیخەینەکار، بەڵام کاتێک دێتە سەر باسی دژوارترین و ئاڵۆزترین و گرنگترین ئۆرگانیزم واتا خودی مرۆڤ هیچ جۆرە یارمەتی و ڕێنماییەکی لەگەڵدانییە. بۆ هۆشیار بوون لە شێوازی کارکردنی ئامێری کۆمپیوتەری ناوەوەمان پێویستمان بە کتێبی ڕێنمای هزر و عەقڵی خۆمانە. ئەم کتێبە بەومەبەستەوە نوسراوە.

سەرەنجام کاتێک جەختکردنەوە و ئاراستەکان لە تاکەوە بەرەو بابەت و ڕێسایەکی تەندروستی هەڵبژاردن و درکی زانیارییەکان ڕێکخراوبێت، زۆربەی گرفتەکانی سەرەتای ئەم بەشە چارەسەر

دەبن، قوتابییەکان بۆ خوێندنەوە و فێربوون و یادهێنانەوەی هەر وانەیەکی زانستی کە پێویست و گرنگە، ئامادە و پڕچەک دەبێت. هەر قوتابییەک ئەو توانایەی دەبێت کە بابەتەکان بەوخێراییەی کە خۆی دەیەوێت پەرەپێبدات و لەسە بنەمای ویست و ئارەزوو و تاناکانی خۆی پۆلێنبەندی بۆ بابەتەکان دەکات و کۆنتڕۆڵی بارودۆخەکە دەکات. (شێوەی ژمارە ٣٧ تەماشا بکەنەوە)

سوودێکی تری ئەم تەکنیکە ئەوەیە فێربوون و یادهێنانەوە زۆر سادەتر و چێژبەخشتر و سەرکەوتوو ترە، لە کۆتایدا تەرکیزی تەواو لەلایەن قوتابییەکەوە درووست دەبێت و بە توانا و لێهاتوییەکانی ڕەوشی فێربوون بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە و بەچاوێکی کراوەوە کۆنتڕۆڵ دەکات.

تەکنیکی خوێندنەوەی ڕێکخراوی وێنەی عەقڵی (MMOST) کراوە بە دوو بەشی سەرەکییەوە و ئەوانیش: ئامادەیی و بەکارهێنان، هەروەها هەر بەشێکی سەرەکی چوار لقی لاوەکی لێدەبێتەوە:

**ئامادەیی**

گەڕان

کات و ئەندازە

وێنەی عەقڵی زانیارییەکان

پرسیار و ئامانجەکان

## بەکارهێنان

کورتەی باس

پێشەکی

ناوەڕۆک

پێداچونەوە

پێش باسکردن ئەو خاڵە گرنگە بیخەینەڕوو کە ئەگەرچی هەنگاوە سەرەکییەکان بەشێوەیەکی پلەبەندی خراونەتەڕوو، بەڵام ئەم ڕیزبەندییە بەهیچ شێوەیەک ناچاریی و پێویست نییە و دەتوانن بەپێی جیاوازی تێکستی خوێندنەوەکان بگۆڕن و کەم و زیادی بکەن.

**تەکنیکی خوێندنەوەی ڕێکخراوی وێنەی عەقڵی: ئامادەیی**

یەکەمین بەش ئەمانەی لای خوارەوەن

- گەڕان
- کات و ئەندازە
- وێنەی عەقڵی زانیارییەکان
- پرسیار و ئامانجەکان

## گەڕان

پێش ئەنجامدانی هەرکارێک گەڕان یان پێداچونەوەی هەموو کتێبەکە یان بڵاوکراوەکەتان پێویستە، دەبێت گەڕیانەکە بەشێوەیەک

ئەنجام بدەن کە وەکو ئەوە وابێت خەریکی تەماشاکردنی ئەو کتێبانەن کە دەتانەوێت لە کتێبخانەکە بیکڕن یان لە کتێبخانەی گشتی بەکاتی وەریگرن. بەواتایەکی تر بەشێوەیەکی کتوپڕ بەخێرای لە کاتی لاپەڕە هەڵدانەوە لە هەڵهێنجانی ئێوە بۆ کتێبەکە هەست بە ئاستی دژواری کتێبەکە، گونجاندنی نموونە و وێنەکان لەگەڵ دەقەکەدا، بەشەکان، کورتە، دەرەنجام، ... دەکەن.

## کات و ئەندازە

دەتوانین ئەم دوو لایەنە پێکەوە باسی بکەین، چونکە نزیکایەتی و هاوبەشی زۆریان بەیەکەوە هەیە، یەکەمین کارێک کە دەبێت لەکاتی خوێندنەوەدا ئەنجامی بدەین ئەوەیە کە بڕیار لەسەر کاتی خوێندنمان بدەین، دواتر ژمارەی ئەو لاپەڕانەی کە لەو کاتەدا دەمانەوێت بیخوێنینەوە دیاریبکەین.

پێداگیری ئێمە لەسەر ئەنجامدانی ئەم دووکارە پێش دەستپێکردنی خوێندن بێهۆ نییە، بەڵکو لەسەر بنەمای ئەو دەستکەوتە زانستییانەیە کە لە لێکۆڵینەوەکانی قوتابخانەی دەروونناسی گشتاڵت دا بەدەست هاتوون. (پێش دەستپێکردنی خوێندنەوەکە چالاکییەکانی شێوەی خوارەوە ئەنجام بدەن)

توێژینەوەکانی قوتابخانەی دەروونناسیی گشتاڵت ئەوەیان سەلماندووە کە مێشکی مرۆڤ ویستێکی زۆری بۆ کامڵ و تەواوکردن هەیە، لەسەرئەم بنەمایە زۆربەی خوێنەران تێدەگەن کە

شێوەی خوارەوە بەم شێوازە ڕێک و ڕیزبەندییان کردووە و ناویان لێناون: هێڵی ڕاست، لولەیی، چوار گۆشە، هێلکەیی، زیگزاگی، بازنەیی، سێ گۆشە، هێڵی شەپۆلاوی یان چەماوەبوو، لاکێشە. لە ڕاستیدا بازنە بازنەیی نییە بەڵکو (بازنەی ناتەواوکراوە)، زۆرێک لە خەڵکی ئەم بازنە ناتەواوە بە بازنەی ئاسایی دەبینن، هەندێکیش بەشێوەی بازنەی ناتەواو دەیبینن بەڵام وابیردەکەنەوە کە وێنە کێشەکە ویستویەتی تەواوی بکات.

نموونەیەکی گشتگیرتر دەربارەی پەیوەندیی گشتیمان بۆ کامڵ و تەواوکردن، پەیوەست بە ویستی ئێمە لە قۆناغی.منداڵیدایە کە هەوڵمانداوە زمانێک درووست بکەین کە یارمەتیمان بدات وێنە و هێما بۆخۆمان درووستبکەین بۆئەوەی سەر لە چواردەورمان دەربکەین و لێیان تێبگەین و ئایدیا ئاڵۆزەکان سەبارەت بە دەوروبەرمان درووستبکەین.

١ ________



٢ ________



٣ ________



٤ ________



٥ ________



٦ ________



٧ ________



٨ ________



٩ ________

شێوەی ژمارە ٣٦. ئەوشێوانەی کە لە سەرەوە بینیتان لە تەنیشتییەوە ژمارە پەیوەستەکانی بنوسن، دواتر سەرنجی ئەمەی کە ئێستا باسی دەکەین بدەن.

لەکاتی خوێندنەوەدا، بڕیاردان سەبارەت بە کات و ئەندازە، ڕێکخستنی کات و قەبارەی لاپەڕەکان و هەروەها خاڵی کۆتایی یان ئامانجمان بەخێرای بۆ ڕووندەکاتەوە. سوود و باشییەکی تری ئەم کارە ئەوەیە لە بری سەرلێشێواوی لە شێوازە خراپەکانی تری خوێندنەوە، پەیوەندییەکی زۆر گونجاو و سەرکەوتوانە لە نێوان بابەتەکاندا درووستدەکات.

گوێگردن لە گوتاربێژێکی هاشێوە کارێکی زۆر چاکە، گوتاربێژێکی کارامە کە مەبەستی ڕوونکردنەوەی بابەتگەلێکی زۆر دژوار و سەختی هەیە، بەزۆری خاڵە سەرەتایی و کۆتاییەکان شرۆڤە و ڕوون دەکاتەوە، بەزۆری کات دیاری دەکات بۆ هەربەشێک کە تایبەتی کردووە. گوێگرەکانیش چونکە ئاگاداری کاتەکەن زۆر ئاسوودەتر گوێدەگرن لە قسەکان.

ئامۆژگاریتان دەکەم بەهێمادانان بۆ سەرەتا و کۆتایی ئەو بەشانەی کە دیاریتان کردوون، کات و ئەو ئەندازەیەی کە دەتانەوێت تیشکی بخەنەسەر بەشێوەیەکی فیزیکی ڕوونبکەنەوە. ئەم کارەتان دەبێتە هۆی ئەوەی هەمیشە ئاگاداری سەرەتا و کۆتایی بابەتەکەتان بێت و بەچاوێکی کراوەوە لێیبڕوانێت.

سوودێکی تری ئەم بڕیارەتان کە لە سەرەتای دەستپێکی بابەتەوە ئەتانەوێت ڕوونی بکەنەوە، ڕێگری دەکات لە ترس و نیگەرانی بەش و پارە ئاڵۆزەکانی بابەتەکانتان. ئەگەر خوێنەرێک بەبێ بەرنامە دەست بکات بە خوێندنەوەی کتێبێکی قەبارە گەورە

بەردەوام دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو قەبارە گەورەیەی کتێبەکەوە و بیرلەوە دەکاتەوە چۆن ئەم کتێبە ئەستوورە تەواو بکات. هەرجارێک کە دەست دەکات بە خوێندنەوە بیری لای ئەوەیە کە هێشتا چەند سەد لاپەڕەی ماوە کە نەیخوێندووەتەوە، هەمیشە بەو ترس و بارودۆخە ناهەموارەوە بەردەوامی دەدات بە خوێندنەوەکەی. لە لایەکی ترەوە ئەگەر ژمارەیەکی گونجاوی چەند لاپەڕەیی دیاریکردووە کە دەبێت بیخوێنێت لە کاتێکی دیاریکراودا ئەوکاتە کارەکە بۆی ئاسانتر دەبێت، بەدڵنیاییەوە دەتوانێت ئەو چەند لاپەڕەیە لەو کاتە دیاریکراوەدا تەواو بکات، دید و تێڕوانینی دەگۆڕێت سەبارەت بە ئەستووری کتێبەکە.

هەڵبەت هۆکارگەلێکی زۆر هەن بۆ بڕیاردان لەسەر کات و ئەندازەی خوێندنەوە کە پەیوەستە بە ئەندازەی توانای هەوڵدانی خوێنەر و ئەو کاتەی کە بەکاری دەهێنێت.

واخەیاڵ بکەن کە دەتانەوێت دوو کاتژمێر خەریکی خوێندنەوە بن، ئێوە سەرنج دەدەن زۆر بەباشی دەچنە پێشەوە و درک و تێگەیشتنتان زۆر باشترە و خێراتر و چالاکانەتر لەوەی کە پێشبینیتان دەکرد دەخوێننەوە.

ئایا لەم کاتەدا دەستخۆشی لە خۆتان دەکەن و پشوو دەدەن؟

یان بڕیار دەدەن کە تا ئەو کاتەی کە ئەم توانا و وزەیەتان تێدایە لەسەر هەمان ڕیتم بەردەوام دەبن لەسەر خوێندنەوەکەتان؟

نەوەد لە سەدی خەڵکی کە وەها پێشهاتێک دێتە ڕێگەیان بڕیاردەدەن بەردەوامبن لەسەر خوێندنەوەکەیان، تەنها ژمارەیەکی کەم پشوودان هەڵدەبژێرن!

لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە ڕێگای درووست پشوودانە! بۆ هۆکاری سەرەکی ئەم بابەتە دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ بەشی یادگە و ئەندازە و توانایی لە یادهێنانەوە، کە لە خولێکی فێربووندا بینیوتانە. ئێمە ئەگەر پشوو نەدەین بە مێشکمان ئاستی درککردن و یادهێنانەوەمان لاوازتر دەبێتەوە، کەواتە هێڵکاری ژمارە ٢٠ بەشێوەیەکی تایبەت پەیوەستە بە پشوودانیشەوە، پێویستە هەر خولێکی خوێندنەوەی لە نێوان ٢٠ بۆ ٥٠ خولەکیدا کاتێکی بچوک بۆ پشوودان بهێڵینەوە، ئەو خوە خراپەی کە هەمیشە فێرخوازەکان گرتوویانە کە زیاد لە پێنج کاتژمێر بەسەر یەکەوە بخوێنن ئیتر کۆن بووە و زیانبارە، نمرەی تاقیکردنەوەکانییان بەڵگەن لەسەر قسەکانمان ئەوان لەکاتی خوێندنەوەدا تێگەیشتنێکی باشییان هەیە بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بەهەمانشێوەش بتوانن بەباشی بیهێننەوەیاد.

بەڵگەی زۆر هەن بۆ گرنگی کاتی پشوودان:

١ – لە ڕووی فیزیکییەوە جەستە پشوودەدات و کاتێکی باش بۆ ئارام فەراهەم دەکات. ئەمکارە بۆ فێربوون زۆر گرنگە و ڕێگرە لەبەردەم ترس و دڵەڕاوکێ.

٢ – دەبێتەهۆی ئەوەی کە یادهێنانەوە توانای تێگەیشتن بەیەکەوە کار بکەن بۆئەوەی باشترین ئەنجام بەدەست بهێنن.

٣ – ماوەیەکی کاتی کەم بۆ زانیارییە تازە فێربووەکان بەهەدەردەدرێت بۆئەوەی هەربەشێک لەگەڵ بەشەکانی تر بەیەکەوە ببەستێتەوە یان تێهەڵکێشی بکات.

هەروەها خاڵی سێیەم پەیوەندیی بە بەشی یادگە و هێڵکاری بیرچونەوە بە تێپەڕبوونی کاتەوە هەیە، بەدرێژای هەرخولێکی فێربوون ئەو ئەندازە زانیارییەی کە دەتوانرێت بەخێرایی لە بەشی خوێنراوەوە بێتەوەیاد بەرزدەبێتەوە و تا کاتی دەستپێکردنی بەشی دواتر هەر بە بەرزی دەمێنێتەوە. ئەمە بەواتای ئەوەیە کە بەهۆکاری گونجاندنی خولی کاتی نەک تەنها دەتوانێت ئەندازەیەکی زۆرتر بهێنێتەوە یاد بەڵکو بەڵگەیەکیتری بوونی ئەندازەیەکی زۆری یادهێنانەوە دیاریکردنی کاتی پشوودانە.

بۆ یارمەیتدانی زیاتری ئەم دوو ڕەهەندە لە هەر خولێکی خوێندنەوەدا پێداچوونەوەیەک لەسەر بابەتە خوێندراوەکانت و پێش زەمینەیەکتان بۆ بابەتەکە هەبێت. ڕونکردنەوەی زیاتر لەسەر بڕیاردان سەبارەت بە کات و ئەندازەی خوێندنەوە پێویستی بە چەندین لاپەڕە هەیە بەڵام لەبیرمان نەچێت بڕیاردان کورتە بۆیە ئێمەش بەکورتی باسمان لێوەکرد کاتێک.

## وێنەی عەقڵی زانست لە بابەتێك

کاتێک لەسەر ئەندازە و ژمارەی ئەو لاپەڕانەی کە دەتانەوێت بیخوێننەوە بڕیارتاندا، لە قۆناغی داهاتوودا هەر زانیارییەکتان لەسەر بابەتەکە هەیە بەخێرایی یاداشتی بکەن، زیاتر لە پێنج خولەک کات بەم ڕاهێنانەوە بەهەدەر مەدەن، دەبێت نوسینەکانتان بە وشەی کلیلی و بەشێوەی وێنەی عەقڵی بێت.

ئامانجی سەرەکی لەم ڕاهێنانە بەهێزکردنی تەرکیز، کەمکردنەوەی نیگەرانی و سەرگەردانی، درووستکردنی (دونیابینی)یەکی عەقڵی تەندرووست. دەستەواژەکەی کۆتایی ئاماژەیە بۆ لێوانلێوکردنی مێشکە بە زانیارییە گرنگەکان لە بری زانیارییە نا گرنگەکان. ئەگەر پێنج خولەک لە یادگەتاندا بەدوای زانیارییە بەسوودەکانەوە بوون، زیاتر مێشکتان هەماهەنگ دەکەن لەگەڵ دەق و تێکستە زانستییەکان نەک بیرتان لای ورگی خاڵی و سەلاجەکەتان بێت نەک مەسجی دۆستەکەت و دراماکەی کاتژمێر نۆ.

لەو کاتە سنووردارە پێنج خولەکییەوە ڕووندەبێتەوە کە ئەم نموونەیە پێویستی بە هەموو زانیارییەکی کەسەکە نییە، ڕاهێنانی پێنج خولەکی زیاتر بۆ چالاککردنی سیستەمی زەخیرەکردنی زانیارییەکان لە یادگە و ئاراستەکردنێکی تەندرووستی عەقڵ و بەرنامە و پلاندانانە.

پرسیارێک کە لێرەدا درووستدەبێت ئەوەیە کە (چی جیاوازییەک هەیە لە نێوان ئەو کاتەی کە هیچ زانیارییەکمان لەسەر بابەتە نییە لەگەڵ ئەو کاتەی کە زانیارییەکی زۆرمان لەسەر بابەتەکە هەیە؟) ئەگەر زانیارییەکی زۆرت لەسەر بابەتەکە هەبێت دەتوانیت پێنج خولەک تەرخانبکەیت بۆ دیاریکردنی لایەنە گرنگەکان، بۆچونەکان، ناو و ڕوودا و شوێنەکان.... لە پەیوەندییاندا بە بابەتەکەوە. چونکە سپاردنی زانیارییەکان بە مێشک زۆر خێراترە لە نوسینی زانیارییەکان لەسەر کاغەز، هەروەها دەتوانن لە ڕووی هزری و عەقڵییەوە هەموو پەیوەندییە لاوەکییەکان ببینن، تێڕوانین و ئاراستەیەکی هزری گونجاو بۆخۆتان درووست بکەن.

ئەگەر زانیارییەکان لەسەر بابەتە لاوەکیی و ناگرنگەکان بوو پێنج خولەک تەرخانبکەن بۆ ڕێکخستنی زانیارییە بچوکەکان و هەروەها هەر جۆرە زانیارییەکی تر کە پەیوەندیی بە بابەتەکەوە هەبێت. ئەمکارەتان دەبێتە هۆی ئەوەی خوێنەر تا ئاستێکی زۆر نزیکی بابەتە نوێیەکان بێتەوە و کەمتر هەست بە ماندووبوون و شکس بکات کە زۆربەی خەڵکی بەداخەوە دووچاری دەبن.

جیاکردنەوەی ئەم دوو جۆرە زانیارییانە جگە لە گرنگییەکەی بەخێرایش لە کاتی خوێندنەوەدا ڕاهێنانی بەردەوام لەگەڵ زانیارییە ڕێکخراوەکاندا قازانجێکی زۆر گشتیشی هەیە. یەکەم کەسەکە بە کۆکردنەوەی زانیارییە تازەکانی لەو بابەتەی کە خۆی حەزیلێیەتی

زانیارییەکی باش وەردەگرێت. بەمشێوەیە کەسەکە لەبری ئەوەی بەردەوام هەست بە خەجاڵەتی بکات لەوەی کە زانیویەتی و ئێستا بیری نەماوە و بەردەوام بڵێت (لەسەر زمانمە) زیاتر دەتوانێت ئاگاداری کۆتا زانیارییەکانی بێت و بەباشی بیریبێتەوە کە چی خوێندەوە و چۆن پۆلێنبەندی کردوون.

ئەم ڕاهێنانە بەردەوامەی یادهێنانەوە و درووستکردنی بیرۆکەی ئەوەی کە لەبەرتان کردوون لە بارودۆخە پێویستییەکاندا زۆر گرنگن: لەوانە لە کاتی تاقیکردنەوەکان، لەکاتی سەرەتای گوتاردان، وەڵامدانەوەی پرسیارە لەناکاوەکان کاتێک کەسێک لێتان دەپرسێت، چەندین سوودی تریشی هەیە.

کاتێک ماوەی پێنج خولەکییەکە تەواو بوو، دەبێت بە خێرای بڕۆینە قۆناغی ئایندەوە.

## پرسیارکردن و پێناسەی ئامانجەکان

دوای ئەوەی کە ڕەوشی گشتی بابەتەکەتان دیاریکرد، لە قۆناغی دواتردا ئامۆژگاریتان دەکەم کە بڕیار بدەن چیتان دەوێت لە کتێبەکە و چاوەڕوانی چی لێدەکەن؟ ئەم قۆناغە ئەو پرسیارانە لەخۆ دەگرێت کە دەتانەوێت بە خوێندنەوەی کتێبەکە وەڵامەکانیتان دەستبکەوێت. ئەبێت پرسیارەکان وەکو ئامانج وابن و هاوشێوەی یاداشتکردنێکی زانستی دەبێت لەگەڵ وشە کلیلییەکان و بەشێوەی وێنەی عەقلی ڕێکخرابێتن.

لە سەرەتاوە نابێت لە پێنج خولەک زیاتر کاتی بۆ تەرخان بکەن، چونکە تا زیاتر کتێبەکە بخوێننەوە پرسیارەکان دووبارە دادەڕێژنەوە و پرسیاری تریشی دەچێتەسەر.

بۆ دڵنیابوون لە گرنگی ئەم ڕێگایە پێویستی دەکرد تاقیکردنەوەیەکی ستاندارد بۆ دوو گرووپ لە خەڵکی لە ڕووی تەمەن، ئاستی خوێندن و زانستییەوە وەک یەک بوون ئەنجام بدرێت.

کتێبێکی هاوشێوە و کاتێکی دیاریکراو دەدرێت بە هەردوو گروپەکە.

بە گرووپی یەکەم دەگوترێت کە دەبێت تاقیکردنەوە لە هەموو کتێبەکەدا ئەنجامبدەن، کەواتە دەبێت ئاگاداری ئەوە بن و هەموو کتێبەکە بخوێننەوە.

بە گرووپی دووەم دەگوترێت تەنها لە دوو یان سێ بابەتی سەرەکی کتێبەکەدا تاقیکردنەوە دەکرێت، دەبێت لەسەر ئەم بنەمایە کتێبەکە بخوێننەوە.

لە ڕاستیدا بۆ هەردوو گروپە تاقیکردنەوە لە هەموو کتێبەکەدا هاتەوە، کەسەکە یەکسەر بیردەکاتەوە ئەوەی کە پێی گوتراوە تەنها لە دوو یان سێ بابەتی سەرەکی کتێبەکەدا تاقیکردنەوەکە ئەنجام دەدرێ، کارێکی نادادپەروەرانە بووە.

هەروەها بیردەکاتەوە دەڵێت بەدڵنیاییەوە لەم بارودۆخەدا گروپی دووەم وەڵامدانەوەیەکی باشییان دەبێت بۆئەو پرسیارانەی

که پێیان گوتراوە لەو دوو بەشە سەرەکییەدا دێتەوە و هەروەها گروپی یەکەم وەڵامدانەوەیەکی باشتریان دەبێت بۆ پرسیارەکانی تر. لە کۆتاییدا نمرەی هەردوو گروپەکە نزیکی یەک بوو.

زۆرێک لە خەڵکی بە سەرسورمانەوە تێبینی ئەوە دەکەن کە گرووپی دووەم نەک تەنها لەو پرسیارانەدا نمرەی باڵا دێنن کە پێشتر پێیان گوتراوە لە دوو بەشی سەرەکی کتیبەکەدا پرسیار دێنینەوە، بەڵکو نمرەیەکی زۆر بەرزتریش دێنن کە ئەگەر لە هەموو کتێبەکەشدا پرسیار بێتەوە.

هۆکارەکەی ئەوەیە کە بابەتە سەرەکییەکان هاوشێوەی قولابێکە بۆ زانیارییەکان کە هەموو شتێک لەخۆی ڕادەکێشێت، بەواتایەکی تر پرسیار و ئامانجە سەرەکییەکان وەکو ناوەندێکی پەیوەندیی کار دەکەن کە زانیارییە لاوەکییەکان وابەست پێوەی و بەدەورخولیدا دەخولێنەوە.

ئەو گروپەی کە قەرار وابوو هەموو کتێبەکە بخوێنێتەوە هیچ قولابێکیان بۆ ڕاکێشان و پەیوەستکردنی زانیارییەکان نەبوو و لەبەرئەم هۆیەش بوو بەبێ هیچ بنەمایەک زانیارییەکانی کۆدەکردەوە. زیاتر هاوشێوەی بارودۆخێک بوو کە ئەوەندە مافی هەڵبژاردن بە خوێندکارەکە دەدرێت کە لە کۆتاییدا ناتوانێت هیچ بڕیارێک بدات، کاتێک بۆ شتانێکی زۆر هەوڵدەدەن لە ڕاستیدا شتێکی ئەوتۆ بەدەست ناهێنن.

تا زیاتر بتوانین پرسیار و ئامانجەکانمان بە باشی دیاریبکەین گرنگییەکەی زیاتر و زیاتر دەبێت. دەبێت ئەوەش بخەینەڕوو کە هەرچی باشتر پرسیار و ئامانەجانمان دابرێژین خوێنەر باشتر دەتوانێت لە بەکارهێنانی تەکنیکی خوێندنەوەی ڕێکخراوەی وێنەی عەقڵی کارایی باشتری هەبێت و سەرکەوتوتربێت.

**تەکنیکی خوێندنەوەی ڕێکخراوی وێنەی عەقڵی: بەکارهێنان**

ئەم بەشە ئەمانەی خوارەوە لەخۆی دەگرێت

- کورتەی باس
- پێشەکی
- لابردنی پار و بەشە ئاڵۆز و دژوارەکان و ئەوانەی کە تێگەیشتنیان سەختە، دواخستنی خوێندنیان بۆ کاتێکی تر
- پێداچونەوە
- یاداشتەکانی تێکست و وێنەی عەقڵ
- پێداچونەوەی بەردەوام

## کورتەی باس

یەکێک لە ڕاستییە قەشەنگەکان سەبارەت بەو کەسانەی کە کتێبە زانستییەکان دەخوێننەوە ئەوەیە کە بەزۆری ئەوانە کاتێک ڕووبەڕووی کتێبێکی زانستی نوێ دەبنەوە لە لاپەڕەی یەکەمەوە دەستدەکەن بە خوێندنەوە.

خەیاڵ بکەین ئێوە حەزێکی زۆرتان بە یاری خشتەکی پازڵ هەیە (پازڵ جۆرە یارییەکە لە کۆمەڵێک پارچە خشتە یان نایلۆنی جیاواز پێک هاتووە هەرپارچەیەکی دەبەسترێتە چەند پارچەیەکی تایبەتەوە لە کۆتایدا ئەو شێوەیە دەردەچێت کە دەتانەوێ زیاتر بۆ زاخاوی مێشکە و بەزۆری شێوەی گیانلەبەرێکە ئەبێت پارچەکانی بەدرووستی ببەستنەوە بەیەکەوە) یەکێک لە هاوڕێیەکانتان بە کارتۆنێکی گەورەوە کە بە کاغەز پێچراوە و بە دەزوو بەستراوەتەوە دێت بۆماڵەوەتان و دەڵێت ئەم کارتۆنە دیاریەکی منە بۆ تۆ: (جوانترین و قەشەنگترین و ئاڵۆزترین پازڵە کە مرۆڤ تا ئێستا دایهێناوە بۆ زاخاوی مێشک) سوپاسی ئەو دەکەن و هەرئەوەی کە هاوڕێکەت ڕۆشت تەماشایەکی کارتۆنەکە دەکەن، بەخۆتان دەڵێن هەر ئێستا کاتی خۆتان تەرخاندەکەن بۆ ئەم یارییە و هەموو پارچەکانی پێکەوە دەبەستن و نەخشەکە ئەدۆزنەوە.

پێش بەردەوامیدان بە خوێندنەکە هەموو ئەو هەنگاوانەی کە بۆ کاملکردنی پازڵەکە دەینێن، هەموو وردەکاریەکان بە دیقەتەوە یاداشتی بکەن.

هەر ئێستا وەڵامەکانتان بەم هەنگاوانەی خوارەوە کە من لە فێرخوازەکانمەوە وەرمگرتون، جێبەجێبکەن:

١ – بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە.

٢ – دەزووی چواردەوری کارتۆنەکە بکەنەوە.

٣ – کاغەزەکەی دەوروبەری لێبکەنەوە.

٤ – کاغەز و دەزووەکان فڕێبدەنە دوورەوە.

٥ – تەماشای شێوەی دەرەوەی کارتۆنەکە بکەن.

٦ – یاساکانی یارییەکە بخوێننەوە، ورد ببنەوە لەسەر پارچە جیاوازەکان و لایەنە گشتییەکانی پازڵەکە.

٧ – کاتی پێویست بۆ کامڵکردنی پازڵەکە دیاریبکەن و پابەندبن پێوەی.

٨ – کات دابنێن بۆ پشوودان و نان خواردنتان.

٩ – کارتۆنەکە بکەنەوە.

١٠ – هەموو پارچەکانی پازڵەکە بخەنە سەر مێزێک یان بیڕێژنە سەر زەوییەکە.

١١ – ئەگەر گومانتان هەیە هەموو پارچەکان بژمێرن و خۆتان دڵنیا بکەنەوە.

١٢ – هەموو پارچە لێکنزیکەکان بخەنە تەنیشتی یەکەوە.

١٣ – پارچەکانی کەنار و تەنیشت و گۆشەکانی بدۆزنەوە.

١٤ – ڕەنگە هاوبەشەکان لێکنزیک بکەنەوە.

١٥ – پارچە و بەشە وەکیەکەکان بەیەکەوە بلکێنن.

١٦ – دەستبەکەن بە پێکەوە بەستنی پارچەکان.

١٧ – پارچە ئاڵۆزەکان بۆ کۆتاییەکەی دابنێن.

١٨ – پرۆسەکە تا کۆتایی ئەنجام بدەن.

١٩ – پیرۆزە!

دەتوانین ئەم نموونەیەش بۆ خوێندنەوە بەکارببەین، نموونەی یەکەم ئەوە ڕوندەکاتەوە کە بۆچی دەستپێنەکردنی خوێندنەوە لە لاپەڕەی یەکەمەوە چەندێک گرنگی هەیە، چونکە وەها کارێک وەکو ئەوە وایە کە گۆشەی یەکەمی بازڵەکە بدۆزنەوە و دڵنییای بدەن بە خۆتان کە لەو سوچەوە دەتوانن هەموو پارچەکانی تری پێوە ببستن و کامڵی بکەن.

خاڵێکی گرنگ و پێویست لە ڕێسا و تەکنیکە گونجاوەکان بۆ خوێندنەوەی تێکست و پەرەگراف بەتایبەتی پەرەگرافە سەختەکان ئەوەیە کە پێش ئەوەی نالەبارییەکانی فێربوون بە دژواری دەستپێبکەن، تێبگەن لە بیرۆکە و ئایدیایی سەرەکی نوسینەکە. شیکردنەوەیەکی کورت بۆ ئەم ئامانجە خراوەتەڕوو ڕەنگە پەیوەندیی هەبێت بە نیگایەکی گشتی، خوێندنەوەی یاسا گشتییەکان، بینین و دۆزینەوەی سوچ و کەنارەکانی بازڵەکەوە. ئەم کارە لە نوسیندا بەوواتایەیە کە ئێوە ئەو کتێبەی کە لە بەردەستتاندایە بۆ خوێندنەوە نیگایەکی گشتی بکەن و سوود لە ڕێنماییە گشتییەکان وەربگرن، بەشەکانی کتێبەکە کە دەبێت ئێوە لە هەنگاو و قۆناغی کورتەی باسدا لەبەرچاوی بگرن لەخۆگری ئەمانەی خوارەوەیە.

| | | |
|---|---|---|
| ئەنجام | خشتە و هێڵکارییەکان | ناونیشانە لاوەکییەکان |
| کورتەی باسەکان | ناوەڕۆک و لیستی بابەتەکان | ساڵ و بەروارەکان |
| بەشەکانی کۆتایی | چەمکە گرنگەکان | وشە دیارەکان |
| ســــــەیرکردنی | | |
| بەشەکانی سەرەتا | وێنەکان | نموونەکان |
| یاداشتەکان | خاڵە جەوهەرییەکان | ژێرنوسەکان |
| پشتی بەرگی کتێبەکە | نەخشەکان | ئامارەکان |

کارایی ئەم بەشە فەراهەمکردنی زانینێکی گونجاوە لە بەشە گرافیکییەکانی کتێبەکەوە، پێویست ناکات کە هەموو کتێبەکە بخوێننەوە بەڵکو ئەو بەشە تایبەتانە هەڵبژێرن کە لە ڕووی واتاییەوە پەیوەستن بە دەقە سەرەکییەکەوە، لەم قۆناغەدا شێوەی ناوەندی و ڕەگە سەرەکییەکانی وێنەی عەقڵیتان کامڵ بکەن.




شێوەی ژمارە ٣٩. ئەو بەشانەی کە لە نوسینەکەدا دەبێت لە قۆناغی کورتەی باس بیخوێنیت

خاڵێکی تر کە زۆر گرنگە ئاماژەی پێبدەین ئەوەیە کە بەدرێژای قۆناغی کورتەی باس، سوود لە پێنوس یان هەرشتێکی تر وەرگرن کە سوودتان پێدەگەیەنێت بۆ دیاریکردنی شتە گرنگەکان.

هۆکاری ئەم کارە دەتوانین بە هێڵکارییەک بە باشترین شێوە ڕونبکەینەوە، ئەگەر یارمەتی چاو نەدرێت ئەوە بۆماوەیەکی کەم تەرکیز لەسەر هێماکان دەمێنێت و دواتر تێدەپەڕێت و لەوێوە کە ئاراستەی جوڵەی چاو لەگەڵ هێماکان یەکسان نییە، تەنها یادگەیەکی ناکارا و لێڵ و ناڕێکوپێک لە مێشکدا دەمێنێتەوە.



شێوەی ژمارە ٤٠. نموونەیەکە لە شێوازێکی هێڵکاری کە دەبێت بخوێندرێتەوە.

ئەگەر سوود لە یارمەتییەکی شێوەیی وەرگریین، چاو نزیکی پرۆسەی هێڵکارییەکە دەبێتەوە و یادگەش لەگەڵ هەموو ئەمانەی خوارەوەدا بەهێز دەبێت.

١ – خودی یادگەی شێوەیی.

٢ – جوڵەی چاو کە یادهێنەرەوەیە و نزیکی شێوەی هێڵکارییەکە دەبێتەوە.

٣ – یادەوەری جوڵەی دەست لەکاتی بەدواداچوونی هێڵەکان (یادگەی جوڵەیی).

٤ – یادگەی شێوەیی ڕیتم و جوڵەی کەسەکە.

شێوەی ژمارە ٤١. شێوەی ستانداردی چاو بەبێ یارمەتی لەسەر هێڵکارییەکە کە دەبێتە هۆی ناسازگاریی لە شێوەی هێڵەکە.

یادهێنانەوەی گشتی کە لە ئەنجامی ئەم ڕاهێنانە درووست دەبێت زۆرباشترە لە یادهێنانەوەی تاکی کە بەبێ هیچ ڕێنماییەکی شێوەیی دەخوێنرێتەوە.

ئەوخاڵەش گرنگە کە ئاماژەی پێبدەین کە ژمێریارەکان بەزۆری سوود لە پێنوس و قەڵەمەکانیان دەبینن بۆئەوەی یارمەتی چاویان بدات لە ستوون و هێڵەکاندا. ئەوان بەشێوەیەکی سرووشتی ئەم کارە ئەنجام دەدەن چونکە بە چاوی نائامادەوە یادهێنانەوەی جوڵە درێژەکانی چاو دژوارە.

**پێشەکی (پێش باسەکان)**

دووەمین بەشی خوێندنەوە لە پێش باسدا، خوێندنەوەی هەموو ئەو بابەتانەی کە لە بەشی کورتەی باسدا نەهاتووە، بەواتای ناوەڕۆکی پەرەگرافی کتێبەکە، دەتوانین ئەم بەشە ببەستینەوە بە ڕێکخستنی بەشە ڕەنگکراوەکانی پازڵەکەوە.

لە قۆناغی پێش باسدا دەبێت تەرکیز بکەینەسەر سەرەتا و کۆتایی پەرەگرافەکان، بەشەکان، باس و پارەکان، بە زۆری زانیارییەکان لە بەشەکانی سەرەتا و کۆتاییدا دەنوسرێن.

ئەگەر خەریکی خوێندنەوەی بابەت و وانەیەکی زانکۆن یان کتێبێکی ئاڵۆز دەخوێننەوە، دەبێت هەمیشە بەشەکانی کورتەی ئەنجامەکان و دەرەنجامی کۆتایی لە سەرەتاوە بخوێننەوە، ئەم بەشانە بە زۆری لایەنە سەرەکییەکانی زانیارییەکانن و یارمەتی ئێوە دەدات لە کاتی خوێندنەوەی کتێبەکەدا بابەتە لاوەکی و ناگرنگەکان بناسنەوە و کاتی پێوە نەکوژن. کاتێک بە گوێی ئەم ئامۆژگارییە بکەن کتێبەکە کۆنترۆڵ دەکەن و بە چاوێکی کراوەوە دەستدەکەن بە خوێندنەوە، بە دڵنیاییەوە سەرکەوتن بەدەست دێنن.

لە بەشی پێشەکیدا وەکو بەشی کورتەی باس تەواوی دەقی نوسینەکەی ناخوێنیتەوە، بەڵکو تەنها یەکجاری تر تەرکیز دەکەیتە سەر بابەتە گرنگەکانی. تەماشای شێوەی ژمارە ٤٢ بکە.




ئەو بەشانەی کە دەبێت لە قۆناغی پێش باسدا دوای قۆناغی کورتەی باس بخوێنریتەوە

شێوەی ژمارە ٤٢. ئەو بەشانەی کە دەبێت لە قۆناغی پێش باسدا دوای قۆناغی کورتەی باس بخوێنریتەوە. دووبارە هەر زانیارییەکی گرنگتان سەرنجدا، بیخەنەسەر وێنەی عەقڵیتان

ناتوانین لەوە زیاتر قسە لەسەر بایەخی ئەم کارە بکەین. فێرخوازێک کە لە ئۆکسفۆرد دەخوێنێت چوار مانگە کێشمەکێشیتی لەگەڵ کتێبێکی قەبارە ئەستووری ٥٠٠ لاپەڕەیی سەبارەت بە دەروونناسی. کاتێک گەیشتە لاپەڕەی ٤٥٠ بێهیوابووبوو. تا زیاتر لە کۆتایی کتێبەکەوە نزیکتر دەبێتەوە ئاستی ئەو زانیارییانەی کە

دەبوو زەخیرەی بکات و بیزانێت زۆرتر دەبوونەوە، لە ڕاستیدا پێش ئەوەی بگات بە ئامانجەکەی نغرۆی زانیارییەکان بوو.

لێرەدا ڕوونبوویەوە کە ئەو لە سەرەتایی کتێبەکەوە پیت بە پیت دەستیکردووە بە خوێندنەوە، لەگەڵ ئەوەی کە خەریکە بگات بە کۆتایی کتێبەکە هێشتا نازانێت بەشی دواتر باسی چی دەکات. ئەو کاتێک بەشی یەکەمی خوێندەوە تەخمین و گریمانەی ئەوەی کرد کە ئەگەر هەر وا بەردەوام بێت پێویستی بە ٧٠ کاتژمێرە تا کتێبەکە تەواو دەکات و ٢٠ کاتژمێریش بۆ یاداشتکردنی، هەمیشە بیری لای ئەوە بوو کەی دەبێت تەواوی بکات.

لە قۆناغی کورتەی باس و هەروەها لە قۆناغی پێش باسیشدا دەبێت بە شێوەیەکی زۆر جدی و وردەوە چەند بابەتێک هەڵبژێرن و هەندێکیش لاببەن، زۆرێک لە خەڵکی هێشتا وا دەزانن کە دەبێت هەموو بابەتەکانی ناو کتێبەکە بخوێننەوە تەنانەت ئەگەر پەیوەندیی بە ئامانجەکەی ئەوانیشەوە نەبێت. دەبێت وا ڕەفتار لەگەڵ کتێبدا بکەین کە خەڵکی لەگەڵ گوفتار و قسەکردندا دەیکات، بە واتایەکی تر قسەکانی کەسێک بێزارکەر و ناپێویست بوو ئەوا قسەکانییان بەهەند وەرمەگرن ئەگەر لە کاتی قسەکردندا زیاد لە ڕادە نموونە دێنێتەوە و لە بابەتی سەرەکی لادەدات و هەڵە دەکات، ئێوە بە پێی ئامانجەکەتان بچن بە ڕێوە و ئەوەی کە دەتانەوێت لێی وەربگرن و گرنگی بە بابەتە لاوەکییەکان مەدەن.

**لابردنی پار و بەشە ئاڵۆزەکان و ئەوانەی کە تێگەیشتنیان سەختە، دواخستنی خوێندنیان بۆ کاتێکی تر.**

**پێداچونەوەیەکی کورت**

دوای ئەنجامدانی قۆناغەکانی کورتەی باس و پێش باس هێشتا پێویستمان بە زانیاری زیاترە، سەرلەنوێ بابەتەکانی کتێبەکە بخوێننەوە، ئەم قۆناغە لەخۆگری پڕکردنەوەی ئەو بەشانەیە کە هێشتا نەخوێندراونەتەوە، دەتوانین بەراوردی بکەین بە قۆناغی پڕکردنەوەی خانەکانی پازڵەکە، هێشتا ئەم قۆناغە قۆناغی سەرەکی خوێندنەوە نییە چونکە لە زۆر ڕووەوە زۆرێک لە بابەتە گرنگەکان پێشتر چاومان پێدا خشاندووە.



سنووره کێشەدارەکان یان ئەو ناوەندانەی کە زانینی ئێوەی کامڵ نەکردوە

شێوەی ژمارە ٤٣. ئەو بەشانەی کە لە قۆناغی پێداچونەوەیەکی کورتدا کامڵ دەبێت، بەهەمانشێوەی کە بەرەوپێشەوە دەڕۆی زانیارییە پەیوەندییدارەکان بە وێنەی عەقڵیتان بخەنەسەر.

لە شێوەی ژمارە ٤٣ دا دەتوانین ئەوە تێبگەین کە هێشتا چەند بەشێک هەن کە تەنانەت لە قۆناغی پێداچونەوەیەکی کورتدا بە کامڵنەبووی ماونەتەوە. هۆکارەکەی لە خوارەوە دەخەینەڕوو.

جارێکی تر بەراوردکردنی لەگەڵ پازڵەکەدا ڕووندەبێتەوە:

ئازاردانی مێشک بۆ دۆزینەوەی ئەو لایەنانەی کە پەیوەندییان بە بابەتە دژوارەکانەوە هەیە دەبێتە هۆی بەهەدەردانی کات و درووستکردنی بارگرانی بەسەر خوێنەرەوە. بەشە ئاڵۆز و ناخۆشەکانی کتێبەکە زۆر بەکەمی پەیوەندییان بە بەشەکانی دواتری کتێبەکەوە هەیە و سوودیان کەمترە و باشتر وایە جێبهێڵدرێن و بەسەریدا تێپەڕن.

١ – ئەگەر یەکسەر ڕووبەڕووی بەشە ئاڵۆزەکان نەبینەوە یارمەتی مێشک دەدەین چالاکتر بێتەوە. (زۆرێک لە خوێنەرەکان لە سەرەتاوە پرسیارگەلێک بە مێشکیاندا ختورە دەکات کە وەڵامەکەی زۆر ئاڵۆز و نهێنی دیارە بەڵام دوای بەردەوامی دان بە خوێندنەوە سەرنج دەدەن پرسیارێکی زۆر سادە و وەڵامێکی ئاسانی هەبووە.)

٢ – ئەگەر دواتر بگەڕێنەوە سەر بەشە ئاڵۆزەکان دەتوانن لە هەردوولاوە لێوەی نزیک ببنەوە، ڕێک وەکو یاری پازڵەکە پارچە ئاسانەکان بدەن بە دەمی یەکەوە ئاڵۆزەکان دەمێنێتەوە ئاسانتر کارەکە ئەنجام دەدەن، ئێوەش دەتوانن بابەتە سادەکان بخوێنن و پاشان بچنە سەر باسی بابەتی ئاڵۆز و گران.

٣ – تێپەڕین بەسەر بەشە ئاڵۆزەکاندا یارمەتیمان دەدات بۆ دوور کەوتنەوە لە نیگەرانی و نائومێدی کە بە زۆری لە خوێندنی نەریتیدا دووچاری زۆربەی خوێنەران دەبێت.




شێوەی ژمارە ٤٤. پەڕینەوە لە بەشە سەخت و گرانەکان کە خوێنەر دوای شارەزایی وەرگرتن لە کۆی گشتی باسەکە دووبارە بە چاوێکی کراوەوە بۆی دەگەڕێتەوە.

خاڵێک کە گرنگە لێرەدا باسی بکەین ئەوەیە کە دەبێتەهۆی ئەوەی کە خوێندنەوەکەمان ببێت بە پرۆسەیەکی دەسترەنگینی و چێژبەخش.

بەگەڕانەوە بۆ پێشکەوتنە مێژووییەکان لە هەموو بوارەکاندا دەتوانین ئەوە تێبگەین کە بەزۆری لە کۆمەڵێک لە هەنگاوە بچووکەکان لە ڕووی لۆجیکییەوە پەیوەندییان بەیەکەوە هەبوە کە ڕێنوینیکەری کۆی گشتی پرۆسە زانستیەکە بوە.

پسپۆڕان هەستیان بەم هەنگاوانە کردوە لە نموونەی گالیلۆ و ئەنیشتاین کە دواتر هەنگاو بە هەنگاو بیرۆکەکانیان پەرەپێدا و دواتر پسپۆڕانی دوای خۆیان بە تەدریجی و کەم کەم گەشتن بە بیرۆکەکە، زۆرێک لە کەسەکان هەر لەسەرەتاوە و هەندێکیش بە خۆماندوکردن و بە کرداریی دەگەن بە ئەنجامی کارەکانیان.

بەهەمان شێوەش کە کەسی داهێنەر هەنگاوگەلێکی زۆر دەنێت تا پرۆسەکە بەکۆتا بگەیەنن، خوێنەریش بەو هەنگاوانەدا دەچێت و

ئەو بەشە بچوکانەی (بەشە سەختەکان) کە جێیهێشتوە، توانایەکی چێژبەخش و داهێنەرانەی پێدەدات کە سەرنجی کورت بکاتەوە بۆ گەشتن بە مەتەڵی نوسینەکە و گەشتن بە ئەنجام. تەماشای شێوەی ژمارە ٤٥ بکەن.




شێوەی ژمارە ٤٥. بەرەو پێشچوونی مێژووی بیرو باوەڕو توانای داهێنەرانە.

**پیاچونەوە**

دوای ئەنجامدانی سێ قۆناغەکەی پێشوو لە کاتێکدا کە هێشتا زیاتر پێویستان بە وەڵامی پرسیارەکان یانی چارەسەری گرفتی زانیارییەکانە، ئەوا پێداچوونەوە گرنگە. لەم قۆناغەدا تەنها ئەو بەشانە پڕبکەنەوە کە هێشتا کامڵ نەکراون و دووبارە سەنجی ئەو بەشانە بدەنەوە کە بۆ تێبینی و سەرنجی زیاتر هێماتان بۆ داناون. دواتر یاداشتەکانی تێکست و پەرەگرافەکان و وێنەی عەقڵیتان کامڵ بکەن.

**یاداشتەکانی دەقەکە و وێنەی عەقڵی**

یاداشتکردن لە کاتی خوێندنەوە دوو شێوەی سەرەکی هەیە، کە ئەمانەن:

١ – یاداشتکردن لە خودی دەقەکەوە.

٢ – وێنەی عەقڵی لە کاتی گەشەکردندا.

**١ - ئەو یاداشتانەی کە لە خوودی کتێب (دەق)ەکەوە ئەنجامی دەدەن، ئەمانە دەگرێتەوە:**

١. هێڵ بەژێردا کێشانی بابەتەکە.

٢. تێگەشتنی خوێنەر بۆ دەقەکە.

٣. تێڕوانینێکی ڕەخنەیانە بۆ دەقەکە.

٤. کێشانی ڕاستەهێڵ بەژێر ئەو بابەتانەی کە گرنگ و جێگای سەرنجن.

٥. کێشانی هێڵی شەپۆلاوی بە ژێر ئەو بابەتانەی کە دژوارن و ڕوون نین.

٦. دانانی نیشانەی پرسیار بۆ ئەو بابەتانەی کە دەتانەوێت لە کەسێکی بپرسن.

٧. دانانی نیشانەی سەرسوڕمان بۆ بابەتە سەرسوڕهێنەر و ناوازەکان.

٨. کۆمەڵێک هێمای تایبەت بە خۆتت هەبێت لەو شوێنانە دایبنێن کە بابەتەکە پەیوەستە بە ئامانجەکانی خوێندنەوەکەی تۆوە.

٩. وێنەیەکی عەقڵی زۆر بچوک لە پەراوێزەکان.

| | |
|---|---|
| هێڵی ڕاست کە<br>بابەتە گرنگەکان و<br>ئەوانەی کە دەنوسرێن<br>نیشاندەدات | هێڵی پێچدار<br>بابەتە دژوار و سەختەکان<br>یان ئاڵۆزەکان<br>نیشاندەدات |

شێوەی ژمارە ٤٦. ئەو تەکنیکانەی کە بۆ هێمادانانی نوسین و دەقەکان سوودی لێوەردەگیردرێت.

ئەگەر کتێبەکە زۆر بەنرخ نییە ئەتوانن سوود لە پێنوسی ڕەنگاوڕەنگ و قەڵەمی جاف وەرگرن بۆ هێما دانانەکان، ئەگەریش کتێبەکە بەبایەخە و دڵتان نایات شتی لەسەر بنوسن ئەوا بە پێنوسی دارین شتی لەسەر بنوسن، ئەگەر پێنوس و کوژێنەرەوەکە بە کاڵی بەکاریبهێنن ئەوا کەمتر کاغەزەکە پیس دەبێت و بەم شێوەیەش دەتوانن ئامانجەکەتان بپێکن، بەڵام ئەوەش بزانن کتێب بۆ ئەوە درووست نەکراوە تۆزی لێبنیشێت بەڵکو تۆ بەکاری بهێنینە و تا دەتوانیت تێبینی و هێمای لەسەر بنوسە، کتێب بۆ خزمەتی تۆ نوسراوە نەک تۆ بۆ خزمەتی کتێب.

**٢ - وێنەی عەقڵ لە کاتی گەشەکردنیدا**

سەرنج دەدەن کە وێنەی عەقڵی بۆ وێناکردنی دەق و پەرەگرافەکان بەهەمانشێوەی کە بەرەوپێشەوە دەچن لێکچونێکی

زۆری لەگەڵ درووستکردنی بەش بەشی پارچەکانی پازڵەکە هەیە. ئەوکاتەی کە لە سەرەتاوە دیاریکردنی ئەو خاڵانەی کە دەبێت یاداشتبکرێن دژوارە باشتر وایە بەشێکی زۆر لە یاداشتەکانی وێنەی عەقڵی لە قۆناغەکانی کۆتایی خوێندنەوەدا ئەنجامی بدەن بۆئەوەی ڕێگری بکەن لە یاداشتە لاوەکی و ناگرنگەکان.

باشتر وایە لە شێوەیەکی ناوەندییەوە کە لەخۆگری بنەما سەرەکییەکانی بابەتی ئامانجداری ئێوەیە دەستپێبکەن، سوود لەو شێوە ناوەندییە وەربگرن بۆ پەرەپێدان ناونیشانە گرنگەکان و سەرباسی بەشەکان کە ڕەگە سەرەکییەکانی کتێبەکە پێکدێنن.

لە گرنگییەکانی وێنەی عەقڵی لە کاتی خوێندنەوەی کتێبدا ئەوەیە کە زانیارییەکی زۆر پێکەوە دەبەستێتەوە و ڕێکیدەخات کە بەبێ سوود وەرگرتن لەم تەکنیکە کارەکە سەرکەوتوو نەدەبوو و زۆرجار زانیارییە وەرگیراوەکان پەرش و بڵاودەبوونەوە. وێنەی عەقڵی لە کاتی گەشەسەندنیدا ئەو توانا و ئەگەرانە دەدات بە ئێوە کە لە بری هەڵدانەوەی ئەو لاپەڕانەی کە تا ئێستا خوێندوتانەتەوە، بە توانا و وزەوە بگەڕێنەوە بۆئەو بەشانەی کە پێشوتر خوێندوتانەتەوە.

وێنەی عەقڵی ئەو توانایە بە ئێوە دەبەخشێت کە دوای هەندێک خوێندنەوەی بنەڕەتی تەماشا بکەن کە کام یەک لە بەشەکان بۆ ئێوە جێگای بێزاری بووە و کام بابەت و بەش پەیوەندیی بە بەشەکانی ترەوە هەیە. ئەم تەکنیکە ئێوە دەخاتە بارودۆخێکی

داهێنەرانەوە کە دەتوانن داستانەکانتان بەیەکەوە ببەستنەوە، پەیوەندییەکانی نێوان بەشەکان بدۆزنەوە، ئاگاداری بەشە دژوارەکانبن و کاتێکی تایبەتی بۆ خوێندنەوە بۆ دیاریبکەن. قۆناغی کۆتایی خوێندنەوەکەتان لەخۆگری کاملکردن و ئاوێتەکردنی یاداشتەکانە لە دەق و پەرەگرافەوە لەگەڵ وێنەی عەقڵیدا کە وەکو بنەمایەک بۆ خوێندنەوە و پێداچوونەوەی بابەتەکە کار دەکات.

کاتێک ئەم قۆناغەی کۆتایتان تەواو کرد، دەبێت وەکو ئەو کەسەی کە حەزی لە یاری پازڵ هەبوو پیرۆزبایی لە خۆتان بکەن! ڕەنگە ئەم کارە پێکەنیناوی دیاربێت بەڵام لە ڕاستیدا کارەکە زۆر جدیی و گرنگە، ئەگەر تێگەیشتن و درککردن و تەواوکردنی خوێندنەوەکە وەکو جەژن و خۆشی ببینن ئەوا بە دڵنیاییەوە هەر لە سەرەتاوە بە چێژ و ویقارەوە دەخوێننەوە، ئەگەری سەرکەوتنتان زۆر زۆرە.

کاتێک بە باشی بەرنامەی خوێندنەوە پێڕەو دەکەن، ئامۆژگاریتان دەکەم وێنەیەکی زۆری عەقڵی (گرنگ) ئامادەبکەن، کە بنەما و ڕەگ و پێکهاتە سەرەکییەکانی بەشەکانی بابەتەکە کورت دەکاتەوە و دەستپێکێکی کورتی بۆ فەراهەم دەکات.

**پێداچونەوەی بەردەوام**

جگە لە پێداچونەوەی خێرا، بەرنامەیەکی پێداچونەوەی بەردەوامیش گرنگە و دەبێت بە ئاگاییمان سەبارەت بە یادگە و ئەوەی کە لە بەشی یادگەدا باسمان لێوەکرد، ئامادەی بکەین. تا ئێستا ئەوە ڕوون بوویەوە کە یادگە بەخێرای لەگەڵ بارودۆخی فێربووندا هاوشان نابێت، بەڵکو لە ڕاستیدا دوای جێگیربوون و بەرزبوونەوە و پاشان بەرەو نزمبوونەوە دەڕوات.



شێوەی ژمارە ٤٧. ئەم هێڵکارییە ئەوە نیشاندەدات کە لە ڕاستیدا یادگە دوای فێربوون و پێش دابەزینی خێرا، بەرزدەبێتەوە.

کاتێک توانای یادگەمان بەرەو کەمبوونەوە دەچێت پێداچوونەوە یارمەتیمان دەدات بە جێگیری بیهێڵینەوە لانی کەم بۆماوەی دوو تا سێ ڕۆژ یان زیاتر.

هێڵکاری ژماره ٤٨، ئەم هێڵکارییە خێرایی بیرچونەوەی زانیارییەکان دوای فێربونیان نیشاندەدات، هەڵبەت ئەم هێڵکارییە ئەوەش دەخاتەڕوو کە پیاچونەوەی بابەتەکان زیانگەلێکی ترتان بۆ دێنێتەپێش.

## کورتەی باس MMOST (تەکنیکی خوێندنەوەی ڕێکخراوی وێنەی عەقڵی)

نابێت هەموو تەکنیکی خوێندنەوەی ڕێکخراوی وێنەی عەقڵی وەکو یەک زنجیرەیی قۆناغ بە قۆناغ بژمێرین بەڵکو وەکو کۆمەڵێک لە لایەنەکانی دەقی خوێندراوەوە لەبەرچاوبگیردرێت کە لە ڕوی ناوەکییەوە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە، گۆڕانکاریی ڕیزبەندیکردن کە لەم بەشەدا باسمانلێوەکرد بەتەواوەتی قابیلی ڕودانە. دەتوانین پێش دیاریکردنی کات ئەندازەی بابەتەکە دیارییبکەین، پێش دیاریکردنی کات و ئەندازە دەبێت بابەتەکە دیارییبکەین و لە

ئەنجامدا لە سەرەتاوە دەبێت وێنەی عەقڵی تەواو بکەین، دەبێت پرسیارەکان لە قۆناغی ئامادەسازی یان دوای تەواوبوونی هەر یەکێک لە قۆناغەکان بپرسرێن، لە هەندێک لە کتێبەکاندا کە لە قۆناغی کورتەی باسدا وادەردەکەون بێ بنەمان و پەیوەندیان بەیەکەوە نییە دەتوانن ئەوە لابەن یان ئەگەر بابەتەکان پەیوەندییان بە بیرکاری و فیزیاوە هەیە، چەندجارێک دووبارەی بکەنەوە. (فێرخوازێک گەشت بەو ڕاستییەی کە ٢٥ جار لە هەفتەیەکدا خوێندنەوەی چوار بەشی بیرکاری کە ئەویش بۆماوەی ٤ هەفتە لەسەر یەک بە سوود وەرگرتن لەم تەکنیکە زۆر ئاسانترە لە دەرگیربوون و ڕووبەڕووبوونەوەی ڕێسایەکی زمانەوانی، هەڵبەت ئەوەش بڵێین ئەو زۆر بەباشی سوودی وەرگرتبوو لە بەشی چۆنێتی تێپەڕین بەسەر بەشە ئاڵۆزەکاندا.) قۆناغی پێشەکی دەتوانرێت لاببرێت یان دابەشبکرێت بەسەر بەشە جیاوازەکانی تردا، قۆناغی لابردن و سڕینەوەی بەشە دژوارەکان و خوێندنەوە سەرپێیەکان دەتوانرێت لە کاتێکی تر و دەتوانرێت پێداچوونەوەش بەشێوەیەکی جیاواز پەرە پێبدەین یان لاببرێن.

بە واتایەکی تر دەتوانرێت بۆ هەر بابەت و کتێبێک بە دڵنیایی و بە باشترین ڕێگای گونجاوەوە بپەرژێینە سەری، لەکاتی خوێندنەوەی هەر کتێبێکدا دەزانن کە هەر کێشەیەک ڕوویدات ئەوە ئێوەن خاوەنی تێگەیشتنێکی پێشوەختەن بۆ هەڵبژاردنی ڕێگایەکی گونجاوتر و ناوازەتر.

کەواتە لەبری ئەوەی کە خوێندنەوە بێزارکەر و تاقەتپروکێن و دژواربێت، بەردەوام لە گۆڕاندایە و درووست ئەنجام دەدرێت.

هەروەها دەبێت ئەوەش یادبهێنینەوە کە لەگەڵ چەندجارە دووبارەکردنەوەی کە لە کتێب خوێندنەوەدا ئەنجام دەدرێت، بەڵام

خاڵە بنەڕەتییەکە لە شوێنێکی دیکەیە، بە سوود وەرگرتن لە تەکنیکی خوێندنەوەی ڕێکخراوی وێنەی عەقڵی بەشێوەیەکی گشتی بەزۆری زۆربەی بەشەکان تەنها یەک جار دەخوێندرێنەوە و دواتر بەشە گرنگەکان بەشێوەیەکی ورد پێداچوونەوەی بۆ دەکەن.

نموونەی ئەمە لە شێوەی خوارەوەدا خراوەتەڕوو.



شێوەی ژمارە ٤٩. ژمارەی چەندجارەی دووبارە کردنەوەی خوێندنەوەی کتێبەکە بەسوود وەرگرتن لە تەکنیکی خوێندنەوەی ڕێکخراوی وێنەی عەقڵی.

لە بەرامبەر خوێنەرێکی (یەک جار خوێندنەوە لە سەرەتاوە تا کۆتای) تەنها یەک جار لە سەرەتاوە تا کۆتایی کتێبەکە ناخوێنێتەوە بەڵکو چەندین جار دەیخوێنێتەوە. بە بۆچوونی ئەو تەنها یەک جار خوێندنەوەی کتێبەکە گونجاوە، چونکە هەر بەشێکی لە زانیارییەکان دوای بەشێکی تر بەتەواوەتی تێدەگات، ئەو لەوە تێناگات کە گەڕانەوە بۆ دواوە، نەخوێندنەوەی هەندێک لە باسەکان، دووبارە خوێندنەوەی بەشە ئاڵۆزەکان، ڕێکخستنی گشتی و لەبیرچونەوە بەهۆی پێداچونەوەی ناتەواوە ڕێک وەکو ئەوە وایە کە کتێبەکە یان بەشەکەی زیاد لە دە جار خوێندبێتەوە.



شێوەی ژمارە ٥٠. ژمارەی ئەو چەندجارانەی کە کتێبێک بە تەکنیکە کۆنەکان (یەکجار لە سەرەتاوە تا کۆتایی) دەخوێندرێتەوە.

**بۆ پێشەوە**

تەکنیکی خوێندنەوەی ڕێکخراوی وێنەی عەقڵی، دەستکەوتێکی خێرا و چێژبەخشی ئێوە بە جیهانێک لە زانیارییەکان بە ڕێسایەکی گونجاو دەبەخشێت، کە یارمەتی مێشکتان دەدات بۆ فێربوونێکی زیاتر و کاریگەرتر و ئێوە لە فێرخوازێکی بێمەیلەوە دەگۆڕێت بۆ کەسێکی وەکو ئیدوارد هیۆس کە موشتاقانە ئاوێتەی کتێبەکان دەبێت!

## بەشی دەهەم

# بەرنامەی کاری نوێ

**پێداچوونەوە**

- **چی جیاوازییەکی لە بیست و پێنج ساڵدا دەتوانێت بێتەدی**
- **پێداچو ونەوەی توانا عەقڵییەکان و تەمەن**

لە بیست ساڵی ڕابردوودا قەڵەمبازێکی گەورە لە تێگەیشتنی ئێمە بۆ مێشکی مرۆڤ ڕوویدا، لەم بەشەدا نیگای ئاییندەیەک دەکەین کە تێیدا مێشکی بەساڵاوەچوو هێشتا بەرەو پێشکەوتنی زیاتر هەنگاو هەڵدەگرێ.

## چی جیاوازییەکی لە بیست و پێنج ساڵدا دەتوانێت بێتەدی

بە دەستپێکی سەدەی بیست و یەک (سەدەی عەقڵ) هەزارەی سێیەم (هەزارەی مێشک)، ڕەگەزی مرۆیی، بە هەموو ئەو تایبەتمەندییە گەورانەی کە هێشتا درک نەکراون، ئەوان هاتونەتە قۆناغێکەوە بە دڵنیاییەوە مێژوونوسانی ئاییندە وەکو دەستپێکی گەورەترین ڕێنسانسی مرۆڤایەتی لە مێژوودا تەماشایی دەکەن و

ناوی دەهێنن. قۆناغێک کە بەدڵنیاییەوە وەرچەرخانێکی سەرەکییە لە دونیابینی مرۆڤەکاندا.

دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە ٣٠ ساڵ بەسەر کتێبی (توانای مێشک) ڕابونێکی ناوازەم سەرنجدا لە ئارەزووکردن بۆ هونەر، شانۆ، مۆسیقا، زانست، مەعریفە، لێکۆڵینەوەی زەمینی، جیهانی و گەردوونی و ڕەنگە زیاتر لە هەموویان حەز و ئارەزووی ناوازەم بۆ لێکۆڵینەوە لە بابەتە عەقڵی و هزرییەکان بینییەوە.

باوەڕەکانی ئێمە سەبارەت بە توانا ناوازەکانی عەقڵ هەر زوو دووچاری کەموکورتی زانستی هات، بۆنموونە ئەو باوەڕەی کە دەڵێت بە تێپەڕبوونی تەمەنی مرۆڤ توانای عەقڵی لاواز دەبێت.

**پێداچوونەوە، توانا عەقڵییەکان و تەمەن**

تەکنیکی پێداچوونەوەی هەر کەسێک پەیوەندییەکی سەرنجڕاکێشی بە بۆچونی کەسەکەوە هەیە دەربارەی لاوازبوونی توانا عەقڵییەکانی مرۆڤ لەگەڵ زیادبوونی تەمەنیدا، بەشێوەیەکی سروشتی وا خەیاڵ دەکرێ کە بەهای بەهرەی هزری، توانایی یادگە، توانایی لە تێگەیشتنی پەیوەندییە تایبەتییەکان، خێرایی درککردن، پەیوەندیی واتایی، بەڵگەهێنانەوەی لۆجیکی و گشتی و تادوایی.. دوای گەشتن بە تەمەنی ١٨ ساڵی بۆ ٢٥ ساڵی بەرەو لاوازبوونەوە دەڕوات، (شێوەکەی خوارەوە تەماشا بکەن)

بۆئەوەی ژمارەکان ڕاست و درووستبن دوو فاکتەری گرنگ لەبەرچاو بگرن.




شێوەی ژمارە ٥١. ئەم هێڵکارییە ئەنجامی ستانداردی ئەندازەگرتنی توانایی فیکری لەگەڵ بەرزبوونەوەی تەمەن نیشانده‌دات، قسە لەسەر ئەوەیە کە توانا هزرییەکانمان دوای گەشتن بە تەمەنی ١٨ بۆ ٢٥ساڵی کەم کەم بەرەو لاوازی و سستی دەڕۆن.

١ – ئەم کەمبوونەوەیە لە نێوان ٥ بۆ ١٠ لە سەددایە، کاتێک ئاگاداری تایبەتمەندی و توانا بەرزەکانی مێشک دەبینەوە ئەم کەمبوونەوەیە زۆر گرنگ نابێت.

٢ - ئەو کەسانەی کە لەم تاقیکردنەوەیەدا بەشدارییانکردووە و گەشتوون بەم ژمارە و ئەنجامە نائومێدکەرە، لە ژێر سیستەمە کۆن و نەریتییەکانی ئەزموونکردن تاقیکراونەتەوە، کەواتە زۆربەی کات ئەوان بەهرەیان وەرنەگرتووە لە تەکنیکەکانی فێربوون، پێداچونەوە و یادهێنانەوەی سەرکەوتوو.

ئەگەر بە وردی تەماشای شێوەی سەرەوە بکەین، بەئاسانی تێدەگەین کە باردۆخی عەقڵی و هزریی مرۆڤ لە زۆربەی ساڵەکانی ژیانیدا لە ئاستێکی زۆر نزمدابووە. بەواتایەکیتر تایبەتمەندیی و توانایە واقعییەکانی مێشک و عەقڵی ئەو ساڵانێکی زۆرە لە ساردکەرەوەی یادگەدا بەستوویەتی بەبێ ئەوەی بەکاری بهێنێت. جێگای سەرسوڕمان نابێت کە وەها مێشکێکی بەکارنەهێندراو دوای ٢٠ تا ٤٠ ساڵ لە ناچالاکیی و سوود وەرنەگرتنی کەمێک کاراییەکەی سستتر بێتەوە. بەڵکو ئەوە جێگەی سەرسوڕمانە کە ئەم مێشک و عەقڵە هێشتا زۆر بەچاکی ئەتوانێت کار بکات.




شێوەی ژمارە ٥٢. ئەم هێڵکارییە هاوشێوەی هێڵکاری پێشووتر لەسەر بنەمای ئامارێکە کە لە کەسانێکەوە بەدەست هاتووە کە بەشێوەیەکی نەریتی و کلاسیکی تاقیکردنەوەیان لەسەرکراوە، ئەگەر مرۆڤ فێربێت بتوانێت چۆن سوود لە توانا باڵاکانی مێشکی وەربگرێت، ئەوکات لەگەڵ بەرزبوونەوەی تەمەنیدا توانا عەقڵییەکانی نەک دانابەزێت، بەڵکو بەرزیش دەبێتەوە.

لەلایەکی ترەوە ئەگەر مێشک بەبەردەوامی بەکاربهێندرێت ئەوا تواناییەکانی زیاتر و زیاتر دەبێت، کاریگەریی تەمەنیش لە هێلکارییەکەدا بەشێوەیەکی بەرچاو دەبێت. دەتوانین ئەم کاریگەرییە لە یاداشت و نوسینەکانی کەسە بەتەمەنەکان ببینین کە زۆر چالاک و توێژەر و نوسەرن، هەست بەوە ناکەن تواناییەکانییان دابەزیبێت. بەزۆری یادگەیان جێگیرە و بەبەرزی ماوەتەوە و توانایەکانیان لە تێگەیشتن و درک و فێربوندا لە زەمینە نوێیەکانی زانستدا زۆر زیاترە لەو کەسە گەنجە تامەزرۆیانەی کە مێشکێکی گەنجتر و بەگوڕتریان هەیە. (شێوەی سەرەوە تەماشا بکەن)

لە توێژینەوەی کارایی عەقڵ و هزری مرۆڤدا ئەو باوەڕە ناتەندرووستە بوونی هەیە کە دەڵێت لەگەڵ بەسەلاچوندا تواناییەکەی کەمدەبێتەوە، لە ڕاستیدا دەبێت توێژینەوەی زۆر ورد تر لەسەر ئەوکەسانە ئەنجامبدرێت و دوای تاقیکردنەوەش دەتوانین درک بەوە بکەین کە چۆن توانا هزری و عەقڵییەکان دەتوانرێت بەرزتر و چالاکتر بکرێنەوە، نەک لاواز و سست ببنەوە.

ڕۆژانە لە تەلەفزیۆن و ماڵپەڕەکانەوە بە دەیان نموونەی کەسە سەرکێش و یاخییەکان دەبینین و دەبیستین کە تەمەنییان لە سەرووی ٧٠ ساڵییەوەیە، تایبەتمەندیی و چالاکییەکانییان بەزۆری چالاکیی و وزە، گورجوگۆڵی، قسەخۆش و دڵشاد، توانای جەستەیی بەرز، خۆڕاگری، سەرشێتی، بەهێزی، ڕۆشنبیر و

خوێنەر، میهرەبانی، یادگەی بەهێز، عاشق و ئەویندارى، هۆگرى و چەندانی تر. ئەوان بە عیشقەوە لە جیهان و تەمەنەکەیان دەڕوانن، ئەم تایبەتمەندییانە لەوانەن کە ئێمە زیاتر دەمانەوێت منداڵ و هەرزەکارەکانمان تێیاندابێت.

لە کۆتاییدا ئەوە بڵێم، ئێمە دەبێت تێبگەشتبێتین کە ئەگەر سوود لە تەکنیک و یاسا گرنگەکان وەربگرین، بایەخ بەو ڕێسایانە بدەین کە بۆ درک و هێشتنەوە و بەکارهێنانی مێشکی ئێمە ئامادەکراوە ئەوا بە دڵنیاییەوە چیرۆکی (ئیدوارد هیۆس) چیرۆکی هەمووومان دەبێت.

**قسەی کۆتایی**

کاتێک کە دەگەن بە کۆتایی کتێبەکە، هیوادارم لەوە تێگەشتبێتن کە ئەمە کۆتایی کار نییە، بەڵکو دەستپێک و سەرەتایە. بە قەشەنگی فیزیکی و ئاڵۆزی مێشکی ئێوە و توانا هەستیی و عەقڵییە زۆرەکانی، بە تواناتان لە وەرگرتنی زانیارییەکان و پاراستنی ئەو زانیارییانە و بە تەکنیکە نوێیەکان کە یارمەتی مێشکتان دەدات بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش ڕێکیان بخات و سیستماتیکیان بکات کە زیاتر هەماهەنگە لەگەڵ کرداری ئێوەدا، خوێندن و بەدواداچوون و فێربوون و لە هەموو ژیانتاندا دەبێت ببێت بەوەی کە دەتوانێت: پرۆسەیەکی دەرون و چالاکبەخش بەدیبهێنێت، کە نەک تەنها نابێتە هۆی تورەبوون و بێزاریتان بەڵکو چێژ بەخش و دڵخۆشکەریشە.

ئەوانەی کە دەیانەوێت زانیاری زیاتر لەم بوارەدا بەدەستبهێنن و زیاتر لەسەری فێرببن، پەیوەندیی بکەن بە نوسینگەی کارمەوە لە ڕێگەی ئەم ئادرەسانەی خوارەوە:

دامەزراوەی بوزان www. Buzanworld.com

ژمارەی تەلەفۆن (بەریتانیا – لەندەن): ٠١٦٢٨٤٨٢٧٦٥

ئیمەیڵ: tony.buzana@buzanworld.com